# داعش

## کێیەو مەشروعیەتی لە کام سەرچاوە وەردەگرێت

لا إله إلا الله




محەمەد هەریری

# داعـــش

## کێیە و مەشروعیەتی لە کام سەرچاوە وەردەگرێت

نووسینی: محەمەد هەریری

2015

# • داعش کێیه و مەشروعیەتی لە کام سەرچاوە وەردەگرێت

• نووسـینی : محەمـەد هـەریـری
• کۆکردنەوەو ڕێکخستنی : ئـاری عەبدوڵڵا
• نەخشەسازی : مستەفا فارس فاضـل
• ساڵی چاپی ئەلیکترۆنی: 2015 - چاپ یەکەم - هەولێر

لەبڵاوکراوەکانی دەزگاری راگەیاندنی (ستاندەر)

زنجیرەی کتێب (16)

دەزگای راگەیاندنی ستاندەر




2015

ماڵپەڕ: www.skurd.net
ئیمەیڵ: info@skurd.net

# پێشـەكی

دوای دروسـت بـوونی رێكخـراوی داعـش، زاراوەی "داعـش" بـرەوی سەندو بۆتـە رەمزی تونـدوتیژی ئـایینی، داعش و گروپـە هاوشێوەكانی لـە دوو هێز سود وەردەگرن، یەكێكیان هێزو تەكتیكی سەربازی، ئەویتریان بیرو ئایدیای ئـاینی كەیارمەتیدەریانـە بۆ تونـدوتیژی و تـەقلی بـوونی هاوبیرانیـان لـە هـەموو لایەكی دنیا، ئـەو گروپـە لـە هێزی یەكـەم سود لـە گشت بەرهەمـەكانی مۆدێرنـە وەردەگرێـــــت. لـــــە (چـــــەك و جبەخانـــــەو میـــــدیاو ئینتـــــەرنێت بەتۆرەكۆمەڵایەتیكانیشـەوە). هێزی دووەم بیرو روحیـەتی جـەنگاوەری ئـاینی، داعش بـۆ هـەر كـارێكی قێزەونـی پاساوێكی شـەرعیشـی بـۆ دەهێنێتـەوە، سـودی لەگشت ئـەو دەقانە وەرگرتووە، كـە بـرەو بـە پـەلـهاوێژو كردەوە توندوتیژیـەكانی دەدات.

لە ماوەی رابردوو شرۆڤەو شیكاری زۆر لەسەر رێكخراوی داعش كراوە، بـەڵام لـەم كتێبـەدا جیـا لـە لێكدانـەوەی "نظريـة المـؤامرة" بـۆ ئـەو رێكخـراوە، تیشكــخراوەتــە ســەر هێـزی دووەمـی گروپەكـە، بـەكارهێنانی بیـرو روحیـەتی جەنگاوەری ئاینییە، داعشیەت لە كوێی دەقەكانی ئاینی ئیسلام خۆی مەڵاسداوە، كـە ئامـادەیی تێدایـە لەهـەر چركـە ساتێك سـەرهەڵبدات و هێزێكـی زۆری مرۆیـی دەستكەوێت و پەخشـی تونـدوتیژی بكـات. لـەم كتێبـەدا وەڵامـی "داعش كێیـە و مەشروعیەتی لە كام سەرچاوە وەردەگرێت؟" دەداتـەوە.

ئەو كتێبە لە دەروازەو حەوت بەش پێكهاتووە. كە كۆكراوەی تەواوی ئـەو زنجیـرە بـاس و كۆمەڵـە وتـارەیـە، كـە مامۆسـتا (محەمـەد هـەریری) لەسـەر بیرۆكـەی تونـدەرەوی ئـاینی نوسیوویەتی. لـەو باسـانەدا مامۆستا بـە بوێریـەوە پەنجەی خستۆتە سەر برینەكان، هەروەها رێگەی چارەسەریشی بۆ نـەهێشتن و بەرتەسككردنەوەی توندوتیژی ئاینی دەست نیشان كردوە.

لــە دەروازەی ئــەو كتێبــەدا تیشـكخراوەتە ســەر چەنـد باسـێكی جیـاواز بەتایبەتی ئەو توندوتیژیـەی بەرامبـەر بـە ئـافرەت دەكرێت، بـەناوی ئاینـەوە. لـە بەشـی یەكـەم ئیسـلام وەك ئـاینێكی جەنگـاوەر، باسـی پایـەی عیبـادەت لە چـاو

جیهـاد و، ڕوحـی جەنگـاوەری لە قوڕئانـدا كـراوە. بەشـی دووەم باسـی ڕوحـی جەنگـاوەری لە سونەتدا و، غەزوەی بەنـی قـورەیزە و، ڕوحـی جەنگـاوەری لە لای زانایانی ئومەت كراوە. بەشی سێیەم باسی كـاریگەری ڕوحی جەنگـاوەری ئیسـلام بەسـەر داعشیەكان و موسڵماندا بەگشتی، هـەروەها لە كۆی باسـەكەدا دەرەنجامی خراوەتە ڕوو. بەشی چوارەم باسی بە مەرحەلـی ڕوانـین لە بـەشێك لە دەقەكـان و، خوێنـدنەوەی ئایەتەكـان لە سیاقی گشـتی خۆیـدا و، پێشخسـتنی بەرژەوەنـدی [المصلحة] بەسـەر هەمـوو بەڵگەكـانیتری تەشریع كـراوە. بەشـی پێنجەم تشكخروەتە سەر چارەسەری كێشەكەو كە نەسخی زەمەنی پێویستە.

بەشی شەشەم چەند تەوەرەیەكی جیاواز پێكهاتووە، بەتایبەتی تیشككخراوەتە سەر ئەوەی كە چۆن كورد ڕزگاری دەبێت لە ژێر كاریگەری فۆرمی عەرەبی بۆ ئیسلام و، داعش پەروەردەی باوكانی سەلەفیەتن و، جاشی داعش بە هەزاران جۆخین لە جاشی بەعس ترسناكترە. هەروەها بەشی حەفتەمیش چەند تەوەرەی جیاواز لەخۆدەگرێت، باسی درێژەپێدەرانی داعشیەت كێن، بۆ دروست دەبن و، ترسی دینداری منداڵەكانمان، داعش و بەعس لەیەك سەرچاوە دەركەوتوون، لە شەڕی داعشدا ئەگەر كوردستان سێكیولارو دیموكرات نەبا؛ هەڵوێستی خۆرئاوا چۆن دەبوو، تەكفیری و سەربڕەكان باسی ئیغتیالات دەكەن لەلای موعتەزیلە، ئایە خۆشەویستی ئیبن تەیمیە لەدینە، ئیسلام تەنها بتی عیبادەتی شكاندوە نەك پەیكەری میللەتان دەكرێت.

ئـاری عەبدوڵڵا

# دەروازە

## داعشیەکان کافرن بە خوا چونکە کافرن بە سورەتی ئادەمیزاد

هەرچەندە پێموایە ئەو پۆلێن کردنە بۆ کافر و بڕوادار لە دنیای نوێ و هاوچەرخدا زۆر بەرتەسك بۆتەوە، ئەمڕۆ وڵاتانی پێشکەوتوو لەسەر بنچینەی هاوڵاتی بوون مامەڵە لەگەڵ هاوڵاتیانی خۆیان دەکەن، نەك وەك کافر و موسڵمان و مەسیحی ویەزیدی وجولەکە و هتد. بەڵام خەڵکی گشتی موسڵمانی کورد زۆر تووشی ڕاتەکان دێت، کاتێك لە میدیاکان لە هەندێ کەسایەتی ئایینی وحزبی دەپرسن: ئایە داعش موسڵمانن یان کافر؟! کاتێ هەندێکیان لەبەر هەوای پەنھانیان لەگەڵ داعش دەڵێن: موسڵمانن بەس هەندێك هەڵەیان هەیە!! هەندێك هەڵە یانی کوشتنی هەزاران خەڵك، و سەربڕینی هەزاران کەس، و ماڵوێرانکردنی هەزاران کەس، و بێ مێردکردنی هەزاران ئافرەت، جەرگ سوتاندنی هەزاران دایك، وبێ باوك ودایک کردنی هەزاران منداڵ، ودەستبڕین وڕەجم کردنی سەدان ، بە کۆیلەکردنی هەزاران، وهەتا کۆتایی کارەساتەکانیان دەرهەق بە ئادەمیزاد.

خەڵکی دینداری ئاسایی ناهەقی نییە توشی ئەو شۆکە دەبێت، چونکە ئەوان ئەوان خودایان لا هێندە گەورە و بە بەزەیی و پاکە قەت بە عەقڵیان تێناپەڕێت ئەو درندە بێ بەزەیی و بێ ڕەوشت وبێ بەهایانە ئیمانداربن وهێشتا لە چوارچێوەی ئینتیمای خوادابن. ئەمڕۆ حزبە موحتەرەمەکانی دنیا کە ئەندامێکیان لە ئاساییترین ئەندامدا تا دەگاتە سەرۆك وەزیران نەك مرۆڤێك بکوژێت، بەڵکو گەندەڵیەکی ئابڕووبەری لێ ئاشکرا ببێت، حزبەکە یەکسەر

خۆی لەو ئەندامە بەری دەکات، وداوای لێدەکەن بە زووترین کات دەست لە کارەکەی و ئەندامێتیەکەی بکێشێتەوە! ماقوڵە خوای گەورە، هەزاران کەسی بێباوەڕ و مولحیدی موسالیم و مرۆڤ دۆست وبەخشندە بیبەش دەکات لە شەڕەفی ئەندام بوون، کە مێرووڵەکیان لە ئاودا نەکردوە، کەچی سەرەڕای کارەساتەکانیان، ئەو دڕندانەی داعش و داعشیەکان کە تێنوون بە خوێنی مرۆڤ، هێستا شەڕەفی ئەندام بوون یان لێ نەسێنێتەوە؟! من کە مرۆڤم برام ببێتە داعش تەبەرای لێدەکەم، ئەی خوای کارزانا و باڵادەست کە هێندە هەستیار و پرە لە جوانی و دادپەروەری ماقوڵە شەرمی بەو دڕندانە نایەت کە خەریکە وێنەی ئایین و خودی خواش بۆ تێکڕای بەشەریەت دەشێوێنن و ڕەش دەکەن.

ئەگەر بەپێی دەقی قورئان، خوا فریشتەیەکی نزیك وڕێزداری لە ڕەحمەتی بی سنووری خۆی بیبەش کرد، وکردی بە ئەهریمەن یان شەیتان لەبەر ئەوەی سەری ڕێزو نەوازشی بۆ ئەو ئادەمیزادەی موستەهەقی ئەو ڕیزە دانەنواند، هەرچەندە دەبێ بزانین ئەو کاتە ئەو مرۆڤە هێشتا دینیشی نەبوو ئەهلی فیترەت بوو، ئەی دەبێت ئەوەی سووکایەتی بەو مرۆڤەبێت بکات و شەو و ڕۆژ خوێنی بڕژێنێت و سەریببڕێت وباری تۆپی پێ بە کەللە سەری براوی مرۆڤ بکات، مناڵی بچوکی فێری سەربڕین بکات و منداڵی حەوت مانگەی فێری شەق هەڵدان بکات لە کەللە سەری مرۆڤ، دەبێت حوکمی خوا چی بێت دەرهەق.

بەڕای من وەك چۆن کوفر بە خوا هەیە ، هەرواش کوفر بە ئادەمیزاد هەیە، کوفر بە خوا بریتیە لە باوەڕ نەبوون بە زاتێکی باڵا و بەدیهێنەر ودروستکەری ئەرز وئاسمان، بنچینەکانی کوفر بەخوا هەزاران کتێبی لەسەر نوسراوە و کەم مێرد منداڵ و هەرزەکار و گەنج وپیر هەن نەزانن چیە، چونکە

شەو ورۆژ لەسەر مینبەرەکان و میدیاکان دووبارە دەکرێنەوە و لە واقیعیشدا پیادە دەکرێت.

بەڵام کوفر بە مرۆڤ، بەداخەوە هیچ لە زانایانی ئەو دینەی ئیسلام نە پەیان پێی بردوە، و نە باسیان کردووە وەک کوفر بە خوا ونەهاتوون مەرجەکانی دیاری بکەن! کوفر بە مرۆڤ بریتیە لە داماڵینی مرۆڤ لە قەداسەتی مرۆیی و لە مرۆڤ بوون و سوک سەیرکردنی و قەڵاچۆکردنی و خوێن ڕێشتنی بە هەر پاساوێك، جا پاساوی لە پێناو خوا بێت یان دین یان مەزهەب یان ئایدیۆلۆژیا ویان بە پاڵنەری ڕەگەزپەرستی وجیاکاری وراسیزمی.

کوفر بە خوا یان باوەڕ نەهێنان بەخوا زۆر ئەنجامی مەترسیداری لێ ناکەوێتەوە، ئەگەر نەگاتە کوفر بە ئینسان، چونکە وەك لە حەدیسێکی مسلم دا هاتوە، پێغەمبەر محەمەد [د،خ] دەفەرموێت: [ئەی بەندەکانم، ئێوە ناتوانن زیان بەمن بگەیەنن، وناتوانن سوودیشم پێ بگەیەنن، بەندەکانم ئەگەر یەکەم و دواهەمینتان و مرۆڤ و جنۆکەتان وەك دڵی بەتەقواترین کەستان بوو ، هیچ لە مولکی من زیاد ناکات، بەندەکانم ئەگەر یەکەم و دواهەمینتان و مرۆڤ و جنۆکەتان وەك دڵی بەدکارترین کەستان بوو ، هیچ لە مولکی من کەم ناکات] کەوابوو نە بە باوەڕ و نە بە کوفر وبێ باوەڕی هیچ زیان وسوود بە خوا ناگات، بەڵام کوفر بە مرۆڤ ئاکامەکەی زۆر ترسناکە، چونکە مرۆڤ خوا نییە بە هەر هەڵوێستێك زیان وسوودی پێ نەگات! هەر بۆیە لە قورئاندا لە ئایەتێکدا کە لوتکەی ئیمانی خواییە بە ئادەمیزاد، وگەورەترین ئاگادارکردنەوەیە بۆ ئەوانەی کوفر بە ئادەمیزاد دەکەن، کوشتنی کەسێك [هەر کەسێك بەبێ ڕەچاوکردنی دینی و رەگەزی و رەنگی] بێ ئەوەی کەسی کوشتبێت، یان هەر بۆ بەدکاری کردن

لە زەویدا، بە كوشتنی هەموو مرۆڤایەتی دەزانێت، زیندووكردنەوەشی بە زیندووكردنەوەی هەموو مرۆڤایەتی دەزانێت.

**﴿ مِنْ أَجْلِ ذَٰلِكَ كَتَبْنَا عَلَىٰ بَنِي إِسْرَائِيلَ أَنَّهُ مَن قَتَلَ نَفْسًا بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِي الْأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ النَّاسَ جَمِيعًا وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَا أَحْيَا النَّاسَ جَمِيعًا وَلَقَدْ جَاءَتْهُمْ رُسُلُنَا بِالْبَيِّنَاتِ ثُمَّ إِنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم بَعْدَ ذَٰلِكَ فِي الْأَرْضِ لَمُسْرِفُونَ﴾**
(المائدة: ٣٢)

لە ئایەتێكی تردا دەفەرموێت: : **﴿وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُ جَهَنَّمُ خَالِدًا فِيهَا وَغَضِبَ اللّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُ وَأَعَدَّ لَهُ عَذَابًا عَظِيمًا﴾** ئەوەی ئیمانداریك بكوژێت بە ئەنقەست، سزاكەی دۆزەخە بۆ هەتا هەتایی، وبەر تورەیی خواش دەكەوێت، نەفرەت لێ دەكات و ئەشكەنجەیەكی سەختیشی بۆ ئامادە كردوە[

لە حەدیسیش ئەو مانایە هاتووە، هەرچەندە تایبەتی دەكات بە كوشتنی مرۆڤێكی موسڵمان! هەردەم مرۆڤ هەست بەو جیاوازیە وتەعالیەی قورئان دەكات بەسەر حەدیسدا، كە زیاتر لۆكالی ترن، وەك قورئان جیهانی نین. لە حەدیسێكی مرفوعدا، كاتێ كەسێك دەكوژرێت لە مەدینەدا، پێغەمبەر [د،خ] سەر دەكەوێتە سەر مینبەر، وگووتی: سێ جار پرسی: دەزان كێ ئەو كەسەی كوشتوە؟ گووتیان بەخوا بكوژەكەی نازانین كێیە، پێغەمبەر [د،خ] گووتی: بەو خوایە گیانی منی بە دەستە، ئەگەر خەڵكی زەوی و ئاسمان كۆببنەوە لەسەر كوشتنی ئیمانداریك [لە هەندێ ڕیوایاتدا پیاوێكی موسڵمان] وپێی ڕازیبوون، خودا هەموویان دەخاتە دۆزەخەوە".

**عن أبي سعيد الخدري رضي الله عنه قال : قتل قتيل على عهد النبي صلى الله عليه وآله وسلم بالمدينة ، فصعد المنبر خطيبا ، فقال : " ما تدرون من قتل هذا القتيل بين أظهركم ؟ ثلاثا ، قالوا : والله ما علمنا له قاتلا ، فقال صلى الله عليه وآله وسلم : " والذي نفسي بيده ، لو اجتمع على قتل مؤمن أهل السماء وأهل الأرض ، ورضوا به ، لأدخلهم الله جميعا جهنم** ،..." ئەوەش هەرباشە ئەگەر پەیڕەوی لێ بکرێت، خۆ موسڵمان زیاتر موسڵمان دەکوژێت تا ناموسڵمانان. ئەگەر بەڕاستی هەموو ئایەتەکانی قورئان وەك یەك کاریگەریان هەبا لەسەر موسڵمانان، ئەو دوو ئایەتەی کە کوشتنی مرۆڤ بە گەورەترین تاوان لە قەڵەم داوە، دەبوایە کۆمەڵگایە ئیسلامیەکان خالی با لە کوشتن وبڕین لەسەر پوچترین هۆ؟! موسڵمان ئەوەندەی موراعاتی ئایەتی خواردنی گۆشتی بەراز دەکات، یان خواردنەوەی مەی دەکات، یان قەدەغەکردنی ڕیبا و سوو دەکات، ئەگەر نیو هێندەش موراعاتی ئەو ئایەتانەی کردبا ئێستا کوشتنی موسڵمانێك هێندە گرنگ دەبوو وەك سەردێر باس دەکرا لە میدیاکان! نەك هەتا بە کۆمەڵ کوشتنەکانی هەرا نەنێتەوە.

بەو ئایەت وحەدیسە کار کرابا زۆر لەو کوشت وکوشتارە و زۆر لەو کوفر بە مرۆڤە لاوازتر دەبوو.

زۆر ساویلکەییە لە کەسانێکی مەشرەب سەلەفی بپرسیت ئایە داعش موسڵمانن یان کافر؟ چونکە قەواعیدی تەکفیری ئیسلامی بە گشتی وسەلەفی بە تایبەتی وا داڕێژراوە دەشێت گەورەترین کوفر بە مرۆڤ بکەیت، ئەنفال بکەیت و کیمیا بارانیش بکەیت هێشتا بەبنیشت لەگەڵ خوادا خۆش و چاك بێت! و دەیان زانا و نەزانی سەلەفی وئیخوانی و کەسانی تریش پێیان وا بێت ئەهلی ئیمانە و ئەهلی بەهەشتە مادامەکێ دووا وتەی لا اله الا الله بووە! گرنگ

نييه لاى ئەوانە صدام دوو مليۆن قوربانى مرۆڤى هەبێت، يانى پلەى كوفرى بە ئادەميزاد هەموو سنورێكى تێپەڕاندبێت، گرنگ ئەوەيە ئيمانى بە خوا هەبووە و قورئانى چاپ كردوە، وحەملەى ئيمانى كردوە، و كوشتارى كوردى بەناوى سورەتى ئەنفال كردوە وسوپا ومەعەسكەرەكانى هەمووى بەناوى سەحابەى وەک خاليد و قەعقاع و موسەنا و فاروق كردوە! ئەوە بۆ كەسێكى كە حوكمى ئيسلاميشى دانەمەزراندبوو، كەوابوو چۆن مەحكومى ئەو قەواعيدە سەقەتانەى تەكفير دەتوانن داعش تەكفير بكەن، كە دەيان وەهم و ئاواتى خەياڵى وەك خيلافەت وتەتبيقى شەريعە و ڕەجم و دەستبڕين وحسبە و ڕيش و نيقابى سەپاند بێت؟!

هەر لەبەر ئەو هۆيەشە لە مێژوو چەندين ملهوڕ كە بە سەدان هەزار كەسيان كوشتوە، وبەڵكو خانەوادە وهاوەڵەكانى پێغەمبەريشيان كوشتووە كەچى تا ئێستا ئەوپەڕى ڕيزيان لێدەگيرێت گرنگ ئەوەيە ئيماندار بوونە ياڵلاى دەكرد نيوەى ئومەتيان قەڵاچۆ دەكرد!

لوتكەى كوفرى كردارى بە ئادەميزاد لە قاعيدە وداعش بەرجەستە بوو، هەرچەندە داعشيش تەنها جێبەجێكارى ئاڕاستەيەكى ديارى ناو ئيسلامن. لە نيشانەكانى، ئەوانە وادەزانن ئيمان بەخوا زۆر گرنگترە لە ئيمان بە ئينسان، هەموو مرۆڤايەتى خوێنى بڕژێت چاكترە لەوەى ئەو خوايەى كە زادەى بيروبۆچوونى نادروستى خۆيەتى بڕەنجێت، وەك مەلا عەبدولسەمەدى هەولێرى سەلەفى گووتەنى: " موسڵمان پێويستە قونبەلەى زەرى هەبێت، هەموو عالەميش لەناو ببات بەس في سەبيلى ئەوەى لا اله الا الله محمدا رسول الله سەر بكەوى"!! ئەوە كوفرە بە ئادەميزاد، و كوفريشە بەخوا، نەک لەبەر كوفرى

بە ئادەمیزاد، بەڵكو لەبەر وێناكردنی خوا وەك درندەیەكی تینوو بە خوێنی ئادەمیزاد لە پێناو باوەڕهێنان بەو!

ئەوە كوفر بە مرۆڤە كاتێك ئیبن تەیمیە كوشتنی موسڵمانێك حەڵاڵ دەكات پاش ئەوەی تەكفیری دەكات لەبەر ئەوەی نیەتی نوێژ بە دەنگ دەربڕین دەهێنێت! " الجهر بلفظ النية ليس مشروعا عند أحد من علماء المسلمين ولا فعله رسول الله صلى الله عليه وسلم ولا فعله أحد من خلفائه وأصحابه وسلف الأمة وأئمتها ومن ادعى أن ذلك دين الله وأنه واجب فإنه يجب تعريفه الشريعة واستتابته من هذا القول فإن أصر على ذلك قتل "..مجموع الفتاوى(ج5 ص153)

یان كاتێك ئیبن تەیمیە كوشتنی موسڵمانێك حەڵاڵ دەكات پاش ئەوەی تەكفیری دەكات چونكە مارودوپشك دەخوات! " **الحمد لله أكل الخبائث وأكل الحيات والعقارب حرام بإجماع المسلمين . فمن أكلها مستحلا لذلك فإنه يستتاب فإن تاب وإلا قتل "..مجموع الفتاوى**..(3/ 51)

یان كاتێك كوشتنی موسڵمانێك حەڵاڵ دەكات پاش ئەوەی تەكفیری دەكات لەبەر دواكەوتن لە نوێژ! " **ولا للمستأجر أن يمنع الأجير من الصلاة في وقتها . ومن أخرها لصناعة أو صيد أو خدمة أستاذ أو غير ذلك حتى تغيب الشمس وجبت عقوبته ، بل يجب قتله عند جمهور العلماء بعد أن يستتاب** "..مجموع الفتاوى..(5/ 80)

كوشتنی مرۆڤ بەو هۆكارە سادانە بەڵگەیە لەسەر كوفر بە ئادەمیزاد ئەگەر خاوەنەكەشی خۆی پێ شێخی ئیسلام بێت.

ئەوەش کوفرە بە ئادەمیزاد کاتێك تۆ هەموو ئایەتەکانی مسۆگەرکردنی ئازادی بیروباوەڕ لە قورئاندا دەکوژێنیتەوە بە بیانووی ئایەتی شمشێر، بۆ ئەوەی سەری مرۆڤەکان بە ئاسانی پەل بدەیت.

بەڕای من لینکیکی پتەو هەیە لە نێوان کوفر بە خوا و کوفر بە ئادەمیزاد، هەر کوفرێك بە ئادەمیزاد ڕاستەوخۆ و بەشێوەیەکی تۆماتیکی دەتخاتە خانەی کوفر بە خوا. ئەگەر کوفر بە ئایەتێکی وەك [قل هو الله احد] بە کوفر حسێب بێت، ئەوە کوفر بە ئادەمیزاد، و سورەتی [الانسان] سەرەڕای ئەو هەموو ترسناکیەی کە لێی دەکەوێتەوە، یانی کوفر کردنە بە هەرە گەورەترین ئایەتی خوا کە ئادەمیزادە و سورەتێکی بەناو کردوە! بەڵێ مرۆڤ گەورەترین ئایەتی خوایە، وەك چۆن ڕەنگ و ڕەگەز و زمانیشی ئایەتێکە لە ئایەتەکانی، کەوابوو دەبێت ئایەتی مرۆڤ، یان ئادەمیزاد وەك ئایەتێکی هەرە مەزنی خودا [لقد کرمنا بني آدم] دەبێت بخرێتە سەر ئەو ئایەتانەی تر کە ئەگەر بڕوات پێی نەبێت پێی کافر بیت. بۆیە لای من داعش کافرن بەخوا، چونکە کافرن بە مەزنترین ئایەتی خوا کە مرۆڤە.

لە پێناو ئاسایشی جیهان مرۆڤی کافر بەخوا و باوەڕدار بە ئینسان زۆر پێویستتر و چاکتر وگەورەتر وپیرۆزترە لەو مرۆڤەی باوەڕدارە بەخوا، بەڵام کافرە بە ئینسان، بەقەد گەورەیی خودا، مرۆڤی لا بچووکە.

## چەند نمونەیەك لە وتاری داعشیەکان: نامیلکەی چۆنیەتی ڕەفتارکردن لەگەڵ کەنیزەکانی داعش

بەپێی ڕۆژنامەی ئیندیپێندت لە ٢٠١٤/١٢/١٠، داعش لەو مانگەی ٣ دیسەمبەری ٢٠١٤ نامیلکەیەکی دەرکردوە بە ناونیشانی: (سؤال و جواب في السبي و الرقاب)، کە لە دیوان البحوث و الافتاء لە محرم ١٤٣٦ هـ، دەرچووە، هەرچەندە مێژووەکە دەکاتە نۆڤەمبەری ٢٠١٤، ئەوە کێشە نیە، ئەو نامیلکە یە گرنگە دەرچوە بۆ ڕێگا نیشاندانی داعشیەکان و چۆنیەتی رەفتارکردنی سێکسی بە پلە یەك لەگەڵ کەنیزە دیلەکان!

نامیلکەکە لە ٣٢ پرسیار پێك هاتووە لە لایەن [زانایانی] سەلەفیەتی داعش دەرچووە، وهەموو پرسیارەکانیش بە پێی ئایەت وحەدیس و فەهمی سەلەفی سالح وەڵام دەدرێتەوە، ئەوە چەند نمونەیەکە لە پرسیار و وەڵامەکان، لەگەڵ کورتە کۆمێنتێکی خۆم:

### پ ١: سەبی [دیلی کەنیزەک] چیە؟

و: ئەو ئافرەتانەیە موسڵمانان بە دیلیان دەبەن لە ئەهلی جەنگ. [یەزیدیە قوڕبەسەرەکان ئەهلی جەنگ بوون، یان ئێوەی درندە لەناکاو بەسەریانتان دا دا؟!]

### پ ٢: چی کەنیزەک حەڵال دەکات؟

و: کافر بوونیان حەڵال یان دەکات، ئەو ئافرەتە کافرانە دەبنە حەڵالمان، پاش دابەشکردنی ئیمام، وپاش گرتنیان وهێنانیان بۆ ناو دار الاسلام! [ئەی بۆ موسڵمان بوونیان ئازادیان ناکات؟!]

## پ٣: ئايە سەبيكردنى [بە كۆيلەگرتنى] هەموو ئافرەتە كافرەكان جائيزە؟

و: هيچ ناكۆكيەك يە لە نێوان زانايان لەسەر ڕەوايەتى سەبيكردنى [بە كۆيلەگرتنى] هەموو ئافرەتە كافرەكان، كوفرى ڕەسەن وەك كيتابيەكان [مەسيحى و جولەكە] و وەسەنى [بێ دينەكان ] ، بەڵام ناكۆكيان هەيە لەسەر سەبيكردنى ئافرەتى هەڵگەڕاوە، جمهور دەڵێن جائيز نيە، و بەڵام هەندێ ئەهلى عيلم سەبيكردنى ئافرەتى هەڵگەڕاوەيان جائيزيان كردوە، ئێمە راى جمهورمان لا پەسندە، خواش باشتر دەزانێت [ياعيني، بەڵام سوپاى وەهابى بەدەوى ئافرەتى موسڵمانەكانى لادێكانى دەوروبەرى خۆشيان بە كۆيلە دەگرت]!

## پ٤: جائيزە سێكس كردن لەگەڵ كەنيزەك؟

بەڵێ جائيزە، خودا دەفەرموێت: ( والذين هم لفروجهم حافظون، إلا على أزواجهم أو ما ملكت أيمانهم فإنهم غير ملومين ، فمن ابتغى وراء ذلك فأولئك هم العادون ( سورة المؤمنون، [ما ملكت أيمانهم] يانى كەنيزەك! [بەڵێ دەزانين يا شێخ بەو مانايە دێت!]

## پ٦: ئايە فرۆشتنى كەنيزەك جائيزە؟

و: جائيزە فرۆشتنى و كڕينى و بە ديارى دانى كەنيزەك وسەبايا، چونكە ئەوان مولكى ڕووتن، دەتوانيت مامەڵەى پيبكەيت بەبێ مەفسەدە و زيان پێ گەياندن!! [زيان لەوە زياتر دەبێت چى بێت، مرۆڤ بكەيتە مولكى ڕووت وڕەهاى خۆت وەك تەسبيحێك بيكڕى وبيفرۆشى وبەديارِيش بيبەخشى].

## پ١٣: جائيزە لەگەڵ كەنيزەكيك بخەويت كە بالق نەبوويێت؟

و: سیکس کردن لەگەڵ کەنیزەکی نابالغ جائیزە ئەگەر گونجاو بوو بۆ سەرجێ [چۆن گونجاو بوو مەولانا؟!] ئەگەر ناگونجاو بوو، دەشێت چێژی لی وەرگریت جگە لە سێکس کردن!! [قوربەسەر منالانی ژێردەستیان! ئەوە چ نامرۆییەک وگەوادیەکە بەناوی دین؟! گوو بە شەڕەفی خۆتان و ئەو فیقهە و ئەو فەقیهانەشی کە شتی وا لە مێشکی گواویان دەرچووە!!!]

## پ٢٠: حوکمی کەنیزەکی ڕاکردوو لە سەرداری چیە؟

و: ڕاکردنی کۆیلەی پیاو و کەنیزەکی ئافرەت لە گوناهە گەورەکانە یانی کەبائیرە [چاوی منی، گوناهە ڕاشبکات؟!] لە منصوری کوڕی عبدالرحمن ەوە لە الشعبي لە جریرەوە گوێی لێبوە دەلێت: هەر بەندەیەك رایكرد لە خاوەنەكانی ، ئەوە كافر دەبێت تا دەگەڕێتەوە!! [ئەی ئەگەر كافر نەبوو، كوفرەكەی دوجا وسێجا دەبێت؟! کە کافر بوو کەبائیر چیە؟! ئەگەریش کافر نەبێت بۆ کراوەتە کۆیلە؟! ئەو حەدیسە هاتوە بۆ جەختکردنەوە لەسەر کۆیلایەتی و پاراستنی مافی کۆیلەداران، دەشلێن ئیسلام هاتوە خەلك دەربهێنێت لە عیبادەتی عیباد بۆ عیبادەتی خوا؟]

## پ٣٢: ئایە مەرجە بۆ ئازادکردنی کەفارەت، ئەو کەنیزەکە ئیماندار بێت؟

و: فەقیهەكان یەك ڕان لەسەر ئەوەی كەفارەتی كوشتن دەبێت كەنیزەكە ئیماندار بێت، ناكۆكن لە كەفارەتی سوێند خواردن و ظهار و جیماع لە ڕۆژی ڕەمەزان، جمهور پێیانوایە ئەو ئازادكردنە بەهیچ ناچی بۆ كەفارەت، تەنها ئەگەر ئەو ملەی ئازاد دەكرێت ئیماندار بێت، حەنەفیەكان پێیانوایە وەك كەفارەت

شیاوە ئەگەر ئەو ملە ئیمانداریش نەبێت تەنها لە کەفارەتی کوشتن نەبێت، دیارترین وبەسندترینی ئەو دوو قەولە، قەولی جمهورە!

ئەوە کورتەیەک بوو لە زانستێکی نیمچە ونکراو لە بابەکانی فیقهی هاوچەرخ [هەی خوا ئێوە و ئەو زانستەش وون کات] خواش زاناتر وداناترە.

خۆزگە هەموو موسڵمانێك بە ڕاشکاوانە و بێ پێچ وپەنا دەیگووت: توخوا شەرم لە ختان ناکەنەوە ئەو پۆخلەواتانە لەناو دینتان دابێت؟!! من بەش بە حاڵی خۆم شەرمم پێ دێتەوە، و بەهیچ شێوەیەکیش ئەو نامرۆییەم قبوڵ نییە بە ناوی خوا و دین، پێموایە ئەو دەقانە گوزارش لە قۆناغێکی مێژوویی دەکات و بەسەرچوو، خوا ئەوانە بکوژێت کە هەوڵی زیندووکردنەوەی دەدەن، ئەوە ڕای منە، ئێوەش کەیفی خۆتانە.

## جیهاد - ئەنتیبایوتیکی بەکتریای هەڵگەڕاوەکانە

لە وتارێکیتردا بە ناوی [ جیهاد - ئەنتیبایوتیکی (دژەزیندەی) بەکتریای هەڵگەڕاوەکانە] الجهاد - المضاد الحیوي لجرثومة المرتدین، لە نوسینی صلاح ابي محمد، لەو بابەتە داعشیەدا ئومەتی ئیسلام هەمووی بە نەخۆش وەسف دەکات کە تەنها چارەسەریان جیهادە بۆ لەناوبردنی هەڵگەڕاوەکان، جا ئومەت بەنەزەری داعشیەکان هەمووی هەڵگەڕاوەیە.

خۆشی ئەو وتارە لەوەدایە کە ئیبن تەیمیە وەك چۆن سەرچاوەی ئیلهامی زۆربەی کارە وەحشی وتوندڕەوەکانیانە، ناوی دەنێت بە نوێکەرەوەی پزیشکی [مجدد الطب] و گەورە پزیشکی ئیسلام، کە کاتی خۆی ئەو دەرمانەی وەسفکردوە بۆ ئومەت: "هەر تایفەیەك پابەندی نەکرد بە شەرعێك لە شەریعەتە دیار و لەسەر ڕێکەوتوەکانی ئیسلام، پێویستە شەڕیان لە دژدا بکرێت تا پابەند دەبن پێی... شەڕکردن لەگەڵیان واجیبە هەتا دین هەمووی بۆ خوا دەبێت، وفیتنە هەڵدەگیرێت، هەرکاتێك دین بۆ غەیری خودا بوو شەڕکردن ئەرکە" مجموع الفتاوي: ٥٠١/٢٨. ئینجا دەڵێت: " ئەو دکتۆرە موجاهیدە [مەبەستی ئیبن تەیمیە]! لە کتێبی پێشوودا مجموع الفتاوي: ٣٥٥/٢٨ ، کە بەڕاستی ئینسیکلۆپیدیایەکی چارەسەری دەگمەنە، هەموو بەکتریای زەوی ڕقیان لێیەتی ! دەڵێت: خودا ڕێگای داوە بە کوشتنی برێك لە خەڵك هێندەی کە پێویستە بۆ باشی و سوودی خەڵك، وەك خودا دەفەرموێت: [والفتنة اکبر من القتل] واتە کوشتن هەرچەند خراپ وفەسادە، بەڵام فیتنەی شەڕ و خراپە و فەسادی کافران لەو گەورەترە" ٥٨٠ بەو شێوەیە ئاشکرایە بانگەوازی کوشتن وبڕین دەکات لەسەر دەستی ئیبن تەیمیە، کە نەك دکتۆر نیە، بەڵکو گەورەترین نەخۆشی مێژووی ئیسلامە، و لە خوێن و شەڕ و حیقد و کەراهیەت

زیاتر هیچی پێ نیە بۆ جیهانی ئیسلام، تەنها لای ئەوانەی پەتای ئەویان گرتوە بۆتە دکتۆر. - سەربڕینی خەڵك لە وتارێك بەناوی [بل لكم في الحرق سلف] لە نوسینی حسین بن محمود، هەر لە دەستپێکیدا دەڵێت: الحمد لله القائل في كتابه: **{إِذْ يُوحِي رَبُّكَ إِلَى الْمَلائِكَةِ أَنِّي مَعَكُمْ فَثَبِّتُوا الَّذِينَ آمَنُوا سَأُلْقِي فِي قُلُوبِ الَّذِينَ كَفَرُوا الرُّعْبَ فَاضْرِبُوا فَوْقَ الأَعْنَاقِ وَاضْرِبُوا مِنْهُمْ كُلَّ بَنَانٍ}** [الأنفال: 12].

**ثم الصلاة والسلام على المبعوث بالحسام المفتخر من بين الأنام بقوله: (أعطيت خمسا لم يعطهن أحد قبلي: نصرت بالرعب مسيرة شهر...) [متفق عليه].** ( 12 ) ئەی محمد(صلى الله عليه وسلم) یادی ئەوە بکەرەوە کاتێک پەروەردگارت وەحی و نیگای دەکرد بۆ فریشتەکان کە: بەڕاستی من یارو یاوەرتانم، کەوابوو ئێوەش دڵی ئیمانداران پابەندو دامەزراو بکەن، لەمەودوا منیش ترس و بیم دەخەمە دڵی ئەوانەی کە بێ باوەڕ بوون، دە ئێوەش لە سەرووی گەردنی ناپاکان بدەن و دەست بوەشێنن لە هەموو سەرپەنجەکانیان (تا کافرەکان شمشێریان پێ نەگیرێت).. ببینە هەر لە دەستپێکەوە ئایەتێکی هێناوە بۆ سەلماندنی مەشروعیەتی سەربڕین [دە ئێوەش لە سەرووی گەردنی ناپاکان بدەن و دەست بوەشێنن لە هەموو سەرپەنجەکانیان] دوایی درود وسلاو بۆ گیانی نێردراو بە شمشێری ستایشکراو کە دەڵێت: پێنج شتم پێدراوە کە پیشتر بە کەس نەدراوە: لەوانە سەرکەوتنم بۆ بڕیاردراوە لە دووری یەک مانگە ڕێ.. ئەوەش ئیلهامێکی ترە وەریدەگرن بۆ ترس نانەوە لە دووری یەک مانگە ڕێ، مانگەڕێی چی بە سایەی تەکنۆلۆژیا و ئینتەرنێت و فەیسبوک وتویتەر کە کەوتۆتە دەستی ئەو وەحش ودرندانە، ترس و دزێوی خۆیان و ئیسلام و موسڵمانیان خستۆتەوە بۆ هەموو سوچێکی جیهان.

هەروەها لە وتارێکی تر بە ناوی:[ دڵخۆشکردنی پیاوچاکەکان بە زیندووکردنەوەی سونەتی سەربڕینی کافرەکان! ] إسعاد الأخيار في إحياء سنة نحر الكفار، لە نوسینی أبو البراء النجدي، ببینە مرۆڤ کە نەخۆش بوو چۆن لەجیاتی مێشك، پیسایی لە کەللەی دەبێت، ئەخر سەربڕینی ئاژەڵ بە زۆربەی مرۆڤی سەرزەوی ناکرێت و بینینی بەرگەی ناگیرێت، کەچی ئەو فاشیستە سەلەفیە دەیەوێت دڵی پیاوچاکان بە زیندوکردنەوەی سونەتی سەربڕینی مرۆڤ خۆش بکات!! ئەوەی دڵی پێ خۆش دەبێت، تەنها سەلەفیە داعشی و فشیستەکانی وەك خۆیەتی، ئەوەی یەك زەرە مرۆڤایەتی لە دڵیدا هەبێت بێگومان قێزی لەو کارە بۆگەنە دەبێتەوە. هەر لەسەرەتادا بەڵگە بە قورئان وتەفسیر دەهێنیتەوە ودەڵێت: قال تعالى: {**فإذا لقيتم الذين كفروا فضرب الرقاب حتى إذا أثخنتموهم فشدوا الوثاق**} [سورة محمد:4]. [جا کاتێک گەیشتن بەوانەی بێ باوەڕ بوون، بێنە دەست لێیان و لەگەردنیان بدەن، تا کاتێک کوشتاری زۆریان لێ دەکەن، ئینجا کەهێزیان نەما، بەدیل بیانگرن بەتوندی باڵبەستیان بکەن]

القرطبي دەڵێت:" قورئان نەیگوتوە بیانکوژن چونکە لە گوزارشی لەگەردنیان بدەن، زبری وتوندوتیژیەکی زۆری تێدایە کە لە دەستەواژەی کوشتن نییە، لەبەر وێناکردنی کوشتن بە دزێوترین وێنە، ئەویش مل پەڕاندنە ولێکردنەوەی سەرەلە جەستە وبەرزترین ئۆرگانی لەشە" (لم يقل فاقتلوهم لأن في العبارة بضرب الرقاب من الغلظة والشدة ما ليس في لفظ القتل، لما فيه من تصوير القتل بأبشع صوره، وهو حز العنق وإطارة العضو الذي هو رأس البدن وعلوه وأوجه أعضائه) . ئینجا بەڵگەیەکی تر بە قسەی کاسانی [ أبو بكر بن مسعود الكاساني الحنفي علاء الدين] دەهێنێتەوە کە تەنها لە مێشکی پیاوکوژدا دەردەچێت،

الكاساني دەڵێت " [لەگەردنیان بدەن] ئەوە لەپاش گرتن ودیلكردنە، چونكە لەگەردن دان، مەبەستی لێك جیاكردنەوەی سەر ولاشەیە، ئەوەش لە حاڵەتی شەڕدا ناكرێت، بەڵكو دوای گرتن ودیلكردن دەبێت" ئەو ئایەتە بەڵگەیەكی ڕاشكاوە لە جائیزی سەربڕینی كافراندا لە پێش و پاش دیلكردنیان، زانایانیش وەها لەو ئایەتە تێگەیشتوون"!! ({فأضربوا فوق الأعناق} وهذا بعد الأخذ والأسر لأن الضرب فوق الأعناق هو الإبانة من الفصل ولا يقدر على ذلك حال القتال ويقدر عليه بعد الأخذ والأسر). انظر بدائع الصنائع ج7 /119 وهذه الآية صريحة الدلالة في جواز نحر الكفار قبل أو بعد أسرهم وهذا ما فهمه العلماء من هذه الآية.

## بەڵگەی سەربڕین لە سونەدا

نوسەر دوو بەڵگە دەهێنێت، یەكێكیان قەولی: دەڵێت ابن الاثیر و ابن اسحاق وهیتریش لە سیرەت نوسان لە عمرو بن العاص دەگێڕنەوە، كە دەڵێت: "ڕۆژێك قورەیش كۆببونەوە سەركۆنەی پیغەمبەریان دەكرد، ئەوەی دوچاری هاتوون بە دەستی ئەو، لەو كاتەدا پێغەمبەر [د.خ] دەركەوت وبەلایاندا تێپەڕی وئەوانیش لاقرتێیان دەكرد و دوو س سێ جاری تریش هەر وایان كرد، ئەویش پێیانی گووت: [گوێتان لێیە قورەیشەكان، قەسەم بەوەی گیانی محەمەدی بەدەستە سەربڕینم بۆ هێناون" (اتسمعون یا معشر قریش، والذي نفس محمد بیده جئتكم بالذبح). انظر الرحیق المختوم 88، وهذا الحبیب 121. - دووەمیان: ئیقرار و بڕیار لەسەردان الطبراني بە سەنەدی پیاوە سیقەكانی دەگێڕێتەوە لە فیروز الیملي كە دەڵێت: [كەللە سەری الاسود العنسي هێنا بۆ پێغەمبەر [د.خ]

**[فقد روى الطبراني بإسناد رجاله ثقات عن فيروز الديملى رضي الله عنه قال: (أتيت النبي صلى الله عليه وسلم برأس الأسود العنسي).**

ئینجا چەندین نمونەی سەربڕین دەهێنێتەوە، لە شەڕ وغەزواتەکانی سەحابە وەك شەڕی المختار الثقفي و فتوحاتی ئەفریقیا وڕوداویتریش دەهێنێت، دوایی باسی غەزوەی بني قورەیزە دەکات ودەڵێت:" پاش غەدری بەني قورەیزە سعد بن معاذ بڕیاری کوشتنی پیاوانیاندا و دابەشکردنی ماڵ وسامانیان و بە کۆیلەبردنی مناڵ وژنانیان. پێغەمبەر [د.خ] گووتی: ( تۆ حوکمی خوات بەسەر ئەواندا لە سەرووی حەو ئاسمانەوە). پێغەمبەر [د.خ] بڕیاری سەعدی پەسند کرد، و بەخۆی سەرپەرشتی کرد لەسەر کوشتنیان، وفەرمانی دا بە هەڵکەندنی چاڵەکان، وزیاتر لە ٦٠٠ جولەکەی بۆگەن بوون" **[وقد أقر رسول الله صلى الله عليه وسلم حكم سعد، وأشرف على قتلهم بنفسه، وأمر بحفر الأخاديد، وقد كانوا أكثر من 600 يهودي نتن]**

ئینجا باسی سەربڕینی جەعدی کوڕی درهەم دەکات کە لەسەر دەستی والی ئومەویی خالیدی کوڕی عەبدوڵڵای قەسری بە دڕەندەترین شێوە سەری بڕا لە ڕۆژی جەژن ولەژێر مینبەری مزگەوتدا!! هەموو زانا ونەزانە سەلەفیەکان بەو پەڕی شانازییەوە باسی ئەو سەربڕینە بەبێ هیچ حورمەت دانانێک بۆ خوێنی موسڵمان لەناو مزگەوتیش ولەڕۆژی جەژنیش!! هەر ئیبن تەیمیە لە منهاج السنه زیاتر لە سێزدە جار باسی ئەو پاڵەوانیەتە دەکات، بکوژەکە جەعدی کوڕی درهەم، خالید القسری هێندە دڕندە وخوانەناس بوو نەدەگەیشتە کەوشەکانی زانایەکی وەک جەعدی کوڕی درهەم. بێگومان نوسەر خالیدی قەسری پێ سەلەفی ساڵحە ودەڵێت: لە جەژنی قوربانی ساڵی ١٢٨ هیجری سەرکەوتە سەرمینبەر وگووتی: "خەڵکینە قوربانیتان بکەن، خوا لە ئێمە و ئێوەی قبوڵ

بكات، من قوربانی دەكەم بە جەعدی كوڕی درهەم، كە دەڵێت: خودا ئيبراهيمی نەكردۆتە خەليلی خۆی، ولەگەڵ موسا قسەی نەكردوە، خوا لە ئێمە و ئێوەی قبوڵ بكات!! لەبەر چاوی خەڵكدا سەری بڕی، عەللامە ابن القيم ڕەحمەتی خوای لێ بيت ئەو ڕوداوەی نەمر كرد و ستايسی بكەرەكەی كرد، ولەوبارەيەوە دەڵێت:[**ولأجل ذا ضحى بجعد خالد القسري يوم ذبائح القربان إذ قال إبراهيم ليس خليله كلا ولا موسى الكليم الدان شكر الضحية كل صاحب سنة لله درك من أخي قربان**] قەسەم بەخوا ئەگەر سەلەفيەتی داعشيەت تەنها ئەو شەرمەزاريەی تۆمار كردبێت لە مێژووی ئيسلامدا بەسيەتی بۆ ئەوەی روو ڕەشی دنيا وقيامەت بن، بێن شيعر بهۆننەوە لەسەر سەربڕينی زانايەكی موخاليفی خۆيان، وبيكەنە بەڵگە لەسەر رەوايەتی سەربرينی موسڵمانانی موخاليف بە خۆيان! ببينە بۆ هەموو كارە قێزەونەكانيان دەيان بەڵگە دەهێننەوە لە هەموو سەرچاوەكانی ئيسلام، بە قورئان و حەديس و سيرە و فيقە و مێژوو وهتد...كەوابوو داعش لە بۆشاييەكانی ئاسمانەوە نەهاتوون، بەڵكو ئەو وەحشەن كە ئومەتی ئيسلام لەناو سەرچاوەكان و توراس و كەلەپوری خۆيدا گەورەيان دەكات.

# ئەگەر سەلەفی ساڵح كردبێتیان بۆ ئێمە نەیكەین

داعش و داعشیەت ئیلهام وەردەگرێت، لەو میراتە كلتوریە زۆر و زەبەند و گەورەیەی لە ئیسلامدا بۆیان ماوەتەوە، بە كۆی تێگەیشتنی تایبەتیان لە ئایەتەكان وحەدیسەكان و تەفسیر وفەتواكان و بیروڕاكان بە گشتی، و ئەو مەنهەجە نصوصیە توندوتیژەی كە عەقڵ كۆت وبەند دەكات و ڕۆژانە ڕیسوای دەكات، و دەیكاتە پاشكۆیەكی زەلیلی نەقل .

سەلەفیەت عەقڵی وەك موسی یەك بار مەسرەفی، جارێك بەكاری هێناوە تا مەنهەجی لە كارخستنی عەقڵی پێ داناوە، ئەوانیتر لەو ڕۆژەوە وەك جورمێكی بێ گیان وعەقڵ لە دەورەی ئەو ناوەندە و مەنهەجە ناعەقڵانیەتە دەسوڕێنەوە، بۆیە لە كردەوە تیرۆریست و توندوتیژەكانین لە مرقی ئاسایی ناچن. سەیر لەوەدایە ئەو سەلەفیە داعشیانە، هەر كارێكی قیزەون بكەن، چەندە نامرۆیی و ترسناك و بێزراو و تاوان بیت، زۆر بە كەمالی ڕاحەت و ئاسوودەیی یەوە ئەنجامی دەدەن، چونكە بەرلە ئەنجامدانی تاوانەكە دەیان دەق و بەڵگەی قورئانی وحەدیسی و قسەی سەلەف و دەرەنجامی فیقهی و فەتوای پێیە. كە دەچیتە سەر نووسینەكانیان تووشی شۆك دێیت، كە چۆن وا بە ئاسانی بەڵگە دەدۆزنەوە لەسەر سەربڕینی مرۆڤ و كوشتنی ژن و منداڵ و سوتاندنی مرۆڤ بە زیندوویی و هەموو پۆخڵەواتەكانی تر !كەوابوو داعش و داعشیەت وەك چەمك، نەك وەك جەماعەتێكی دیاریكراو، لە دەرەنجامی ئەو دەقانە و تێگەیشتنیان بۆ ئەو دەقانە ئەو مەخلوقاتە دزێو و شێوێنراوانەی لێ دروست بووە، با چاوێك بخشێنین بە ئەدەبیاتی داعشی هاوچەرخ تا بزانی مەشروعیەتی خۆیان لەكێوە وەردەگرن. - بۆ كوشتنی ژن ومنداڵ لە فەتوایەكدا، بە

ناونیشانی: في جواز قتل الذرية والنساء [جائیزی کوشتنی منداڵ و ژن] ابو قتادة ی فەلەستینی کە بەرای هەموو چاودێرێك بەرپرسە لەو هەموو سەربڕین و کوشتن وخوێن ڕێژیەی کە سەلەفیەکانی **[الجماعة الاسلامية المسلحة]** ئەنجامیان دا زۆر بە ئاشکرا دەڵێت بەپێی حەدیس جائیزە هێرش بکەینە سەر کافر و مورتەد و موشریکەکان - بێگومان یانی خۆیانی لێدەرچێت هەموو خەڵکیتر دەگرێتەوە- هەتا کافرەکان ملشۆڕ دەبن، و پەرت وبڵاو دەبن، وبازنەی شەڕ فراوان دەبێت و دۆڕاندنیان ئاسانتر دەبێت، بە پەرۆشیان بۆ ماڵ ومنداڵ و ژنانیان و بە بڵاوەپێکردنیان لە پێناو پاراستنیان. ئیمامی بوخاری لە سەحیحەکەی چیرۆکی ئەو جاسوسە خوزاعیە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ناردی بۆ زانینی وەزعی قوڕەیش لە کاتی چوونی بۆ عەمرەدا، ئەوەش لە ڕوداوی حودەیبیەدا هاتووە، کە گووتی گوایە ئەحباشەکان هاوپەیمانانیان لە دەوروبەری مەککە بۆ کۆکردۆتەوە بۆ جەنگان لە دژی پێغەمبەر [د.خ] و هاوەڵانی وگووتی: پێویستم بە مە سورەت وڕاوێژتانە، چۆنی دەبین ئەگەر بدەین بەسەر ماڵ ومنداڵی ئەوانەی یارمەتیان دان، ئەگەر هاتن بە هانای ماڵ ومنداڵیان، لە یارمەتی قوڕەیش دادەبڕێن، یانیش بە نیگەرانیەوە لەوێ دەمیننەوە.... **روى البخاري في صحيحه بسنده قال : " خرج النبي [ص] عام الحديبية في بضع عشرة مائة من أصحابه . فلما أتى ذا الحليفة قلد الهدي وأشعره ، وأحرم منها بعمرة ، وبعث عيناً له من خزاعة . وسار النبي(ص) حتى كان بغدير الأشطاط أتاه عينه قال : إن قريشاً جمعوا لك جموعا ، وقد جمعوا لك الأحابيش، وهم مقاتلوك وصادوك عن البيت ومانعوك . فقال : أشيروا أيها الناس علي ، أترون أن أميل إلى عيالهم وذراري هؤلاء الذين يريدون أن يصدونا عن البيت ، فإن يأتونا كان الله عز وجل قد قطع عينا من المشركين ، وإلا تركناهم محروبين . قال أبو بكر : يا رسول الله**

**خرجت عامداً لهذا البيت لا تريد قتل أحد ولا حرب أحد ، فتوجه له ، فمن صدنا عنه قاتلناه . قال : امضوا على اسم الله "** . زانای سەلەفی ابن القيم دەڵێت: لە سوودە فیقهیەکانی چیرۆکی حودەیبیە، ڕەوابوونی سەبیکردن [بە کۆیلەکردن] ماڵ ومنداڵی موشریکانە، ئەگەر بە تەنها جێیان هێشتبوون.

بۆ سوتاندنی مرۆڤ: لە وتارێکدا بە ناوی [**بل لكم في الحرق سلف**] لە نوسینی حسين بن محمود، هەر لە دەستپێکیدا دەڵێت: " مرۆڤ سەری سوڕدەمێنێ لە کەسانێك لەسەر تەلەفزیۆنەکان دەردەکەون و یەکێکیان دەلێت سوتاندنی خەلك نە دین و نە شەرع و نە عەقڵ دانی پێدا ناهێنێت!! وابە ئاسانی درۆ دەکەن لەسەر دینی خودا!!" يدعي أحدهم بأن حرق الناس لا يقره دين ولا شرع ولا عقل !!هكذا، وبكل بساطة يفتأتون على الدين!! یانی هێشتا ئەو سەری سوڕماوە لەو خەڵکانەی دەلێن سوتاندنی خەلك نە دین و نە شەرع و نە عەقڵ دانی پێدا ناهێنێت! ئینجا دەلیت ئیرهاب وترس خستنە دڵی دوژمنان بە شەرع و بە عەقڵ ویستراوە، وەك خوا دەفورموێت: {**وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ وَمِنْ رِبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَدُوَّ اللهِ وَعَدُوَّكُمْ..**} دوایی بەڵگە دەهێنێتەوە بە سوتاندنی حەزرەتی عەلی بۆ ئەوانەی پێیان گووت تۆ خودای! کە لە کتێبی [الملل والنحل للشهرستاني [گواستۆتەوە. ئینجا دەڵێت: ئەوە خەلیفەی ڕاشدینە خەڵکی بە ئاگر سوتاندوە...**فهذا الخليفة الراشد رضي الله عنه أحرق أناس بالنار..** کەوابوو بەربەست چیە ئێمە بیکەین.

خالید ئوستادی قوتابخانەی هونەری ئیرهابی ئیسلامیە لە دوای پێغەمبەر!! دوایی چیرۆکی خالیدی کوڕی وەلید دەگێڕێتەوە کە چۆن لە ملی مالك بن نویەرەی داوە و سەری ئەو پیاوەی لەگەڵ دوو بەردیتر کردۆتە سێکوچکەی ئاگردان و مەنجەڵێك گۆشتی لەسەر برژاندوە، و قژی مالك بن النويرة هێندە

چڕ بوە تا گۆشتەکەش پیگەیشتووە هەر سوتاوە! ئەو کارە وەحشیەتە ئەگەر ڕوویدا بێت، دەکاتە بەڵگە بۆخۆی بۆ سوتاندنی خەڵك! ئینجا ستایشی خالید دەکات و دەڵێت: شمسێری خوا باوکی سلێمان [خالیدی کوڕی وەلید] ئوستادی هونەری ئیرهابی ئیسلامیە و سەرپرشتیاری قوتابخانەکەیەتی لە پاش پێغەمبەر [د.خ [، لە ئیرهابدا دەستیکی باڵای هەیە، زۆر شارەزایی وردی بە جەنگی دەرونی دەردەخات، لە شەڕی ئەلیس لە دژی فارسەکان وەك لە [**البداية والنهاية**] دا هاتوە:"خودایە ئەگەر دەستی ئێمەت زاڵ کرد بەسەریان، پەیمان بێت، هیچیان نەهێڵمەوە تا رووباریان بە خوێنی خۆیان بەردەدەمەوە، پاش سەرکەوتنیان ئاڕاستی ڕوبارەکەیان گۆڕی، و دیلەکانیان کە دەڵین حەفتا هەزاربوون، دەهێنایە سەر ڕەوگەی ڕوبارەکە ولە ملیان دەدان تا ڕوبار لە خوێنیان دروست بێ ! دوایی دیتیان هەر خوێنە دەڕژێت و ڕوبار دروست نابێت، بۆیە چەند ئەمیرێکی جەنگ گوتیان یا خالید تا سوێندەکەت بێتەجی، دەبێت ئاوی روبارەکە بەردەیتەوە سەر گۆمی خوێنەکە، ئەویش فەرمانی کرد بە بەردانەوەی ئاوەکە، ڕووبارەکە یەك پارچە بووە خوێن لە ڕشتنی خوێنی حەفتا هەزار دیل!! یانی غەمی بە عەرزکەوتنی پەیمانەکە و سوێندەکەی خالیدیان بوو، نەك ڕژاندنی خوێنی حەفتا هەزارکەس لەسەر ڕوبارێك! هەر ئەو ساڵ داعش خوێنی هەزار وحەوسەد سەربازی شیعەی بە هەمان شێوە لەسەر ڕوباردا ڕشت! ئینجا چەندین بەڵگە لە قسەکانی زانایان و حەدیس دەهێنێت بۆ سەلماندنی ڕەوایەتی سوتاندنی مرۆڤ.

هەڵواسینی لاشەی کوژراوی نەیاران و دوژمنان لە قورئاندایە! ئینجا دەربارەی هەڵواسینی لاشەی کوژراوی چەند سەربازێکی ئەمریکی لەسەر پردی فەللوجە، دەڵێت: أما قضية تعليق الجثث على جسر الفلوجة الشمّاء، فقد

قال تعالى في أهل الحرابة {**إِنَّمَا جَزَاءُ الَّذِينَ يُحَارِبُونَ اللهَ وَرَسُولَهُ وَيَسْعَوْنَ فِي الأَرْضِ فَسَادًا أَنْ يُقَتَّلُوا أَوْ يُصَلَّبُوا أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُمْ مِنْ خِلاَفٍ أَوْ يُنْفَوْا مِنَ الأَرْضِ ذَلِكَ لَهُمْ خِزْيٌ فِي الدُّنْيَا وَلَهُمْ فِي الآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ**} [المائدة: 33]. ( 33 ) بێگومان پاداشتی ئەوانەی کە دەنجێگن و دوژمنایەتی خواو پێغەمبەرەکەی دەکەن و بە گەرمی هەوڵ دەدەن بۆ بڵاوکردنەوەی فەسادو بەد ڕەوشتی لە زەویدا هەر ئەوەیە: (ئەوانەیان کە خەڵکیان کوشتووە) دەبێت بکوژرێن، (ئەوانەش کەخەڵکیان کوشتووە و جەردەییشیان کردووە) دەبێت لە خاچ بدرێن، )ئەوانەیان تەنها جەردەیی دەکەن) دەست و قاچێکیان بەپێچەوانەوە ببڕدرێت، (ئەوانەیان کە مەترسیان لێدەکرێت) ئەوە دوور بخرێنەوە لە وڵات، ئەوسزایە خەجاڵەتی و سەرشۆڕیە بۆیان لەدنیادا، لەقیامەتیشدا سزای سەخت و گەورەیان بۆهەیە. دوایی دەڵێت: ئەگەر ئەوە سزای شەڕفرۆشان بێت - هەتا موسلمان و نوێژخوێن یش بن- ئەی چی دەڵێن دەربارەی کافری شەڕفرۆش هێرشکەری دەستدرێژیکەر بۆ سەر خوێن و عەرزوناموس و ماڵی موسڵمانان؟ -سوتاندنی هاوڕەگەزبازانیش سونەتە.

دوایی پەنا بۆ فقه دەبات و جەندین بەڵگە لە نيل الأوطارى الشوكاني کە سوتاندن بە ئاگر جێی مشتومڕە لە نێوان اهلی سەلەف: "کە دەڵێت [تەنها خوا بە ئاگر ئەشکەنجە دەدات] ئەوەش هەواڵێکە بە مانای قەدەغە کردنەوە دێت، و سەلەفیش ناکۆکن لەسەر سوتاندن، عومەر وئیبن عەباس و کەسانیتریش بە ڕەهایی ڕەتیدەکەنەوە جا لەسەر کوفر بێت یان جەنگان یان تۆڵە وسزا بێت، حەزرەتی علی و خالیدی کوری وەلید و کەسانیتر ڕێگایان پێداوە" هەر لە کتێبی [نيل الاوطار] حەدیسێك لە البيهقى دەگێڕێتەوە کەوا خەلیفە ابوبکر هاوەڵانی کۆکردۆتەوە بۆ وەرگرتنی ڕایان لەبارەی پیاوێکی هاوڕەگەزبازی نێگەتیڤ، عەلی

لە هەمویان توندتر بوو داوای کرد بسوتێنرێن، هاوەڵانی پێغەمبەریش یەکدەنگ بوون لەسەر سوتاندنی بە ئاگر، بۆیە ابوبکر نامەی بۆ خالید نووسی فەرمانیان پێدەکات بە سوتاندنی .

پێغەمبەریش [د.خ] چاوی عەرنیەکانی بە ئاسنی سورەوەکراو هەڵکۆڵی !ئینجا دەڵێت: لە فتح الباري دا هاتوە [مهەلەب گووتی: ئەو نەهی کردنە [لە سووتاندنی مرۆڤ] بەمانای تەحریم کردنی نیە، بەڵکو بۆ نواندنی تەوازوعە، کاری هاوەڵانیش ڕەوایەتی سووتاندن دەسەلمێنێت، پێغەمبەریش [د.خ] چاوی عەرنیەکانی بە ئاسنی سورەوەکراو هەڵکۆڵی، وئەبوبەکریش ستەمکارە باغیەکانی سوتاندوە بە ئاگر لە ئامادەیی هاوەڵاندا! خالیدی کوڕی وەلیدیش خەڵکێکی لە ئەهلی هەڵگەڕاوەکان سووتاند بە ئاگر، زۆربەی زانایانی مەدینە ڕێگایان داوە بە سوتاندنی شورە و گەمی وکەشتی لەگەڵ خەلکەکەی کە تیایدایە! ئەوە قەولی النووي و الاوزاعی یە!] لە کۆتاییدا دەڵێت:" بە موجاهیدانی عێڕاق دەڵێم :ئەگەر خەڵکتان سوتاند ئەوە نمونەی بەراییتان هەیە لە خەلیفەکانی ئومەت وسەحابەکان، کارێك بەو کافرانە بکەن ترس وتۆقینیان لە دڵدا بڕوێنن،".....

## لە چەواشەکاریەکانی دکتۆر عەبدلواحیدی سەلەفی

## ئینگلیزی زمانی بێ ئەخلاقیە و عەرەبی زمانی ئەخلاقە

ژیان لای ئەو دیندارە سێ سەرینیە یانی بەس عیبادەت و نوێژ و ڕۆژی، و سەرجێیی تاکە موتعەیەکە لای ئەو، بۆیە هەر کات بەسەربردنێکی خۆش لای ئەو دیندارە غەزەبانە یانی گوناه و کات بە فیڕۆدان و غەزەبی خوایە! ئەو نەزانە نازانێت پێغەمبەر د.خ خۆی حەزی بە یاریکردن بوو لەگەل حەزرەتی عائیشە غاردانێ دەکرد! نازانی خەڵك هێندە حەزی لە چیرۆك و بەسەرهات بوو لە سەردەمی عومەر و پاش سەردەمی ئەو هەزاران چیرۆك خوێن [القصاصون] چیرۆکیان بۆ خەڵك دەگێڕایەوە وخەڵکیش لە وەعزی مزگەوتەکان گەرمتر پێشوازی لێ دەکردن. جونکە ناکرێت ژیان هەر بە مەوعیزەی دینیەوە پڕ بکرێتەوە [ان القلوب اذا كلت عميت] دڵەکان کە ماندوو بوون کوێر دەبن! یانی تێڵای عومەر بۆ ماوەیەکیش خەڵکی بێ بەش کردبێت لەو خۆشیە، لە پاش عومەر یان هەر لە ژیانی خۆشی بە دزیەوە، نەیتوانیوە خەڵك قەدەغە بکات لێی.

ژیان هەر نوێژ وتەسبیحات و کڕنۆس وسوژدە نییە، ژیان بەوەوە خۆشە بڕوانیە فیلمێك، زنجیرەیەك، بەرنامەیەك، فیلمێکی دۆکیومنتی، لەگەڵ دوو سێ برادەر دانیشیت بەس قسە بکەن، بەبێ غەیبەت بێگومان! کتێبێکی نوکتە بخوێنیتەوە ، یان بڕوانیە فیلمێکی کۆمێدی ، یان فلمێکی عادل ئیمام ، یا بچیتە شانۆیەك بەس بۆ پیکەنین، پێکەنین وبەس.

لە هەمووی سەیرتر ئەو دکتۆرە غەزەبە شانازی بەوە دەکات کە کاتی خۆی لە تێستێکی زمانی ئینگلیزی زانکۆیەکی بەریتانی سەرکەوتووە، بۆ نەخوێندەوارە سەرسامەکانی باس دەکات، کەچی بە خەڵك دەڵێت ئینگلیزی زمانی بی ئەخلاقیە و عەرەبی زمانی ئەخلاقە.

ئەو دکتۆرە بێ دەماغە دەبێت بزانێت کە ئینگلیزی زمانی زانست و ئەدەب و هونەر و تەکنۆلۆژیایە، نەك بێ ئەخلاقی! عەرەبی ڕاستە زمانی دین و قورئانە، بەڵام لە ٢٢ وڵاتی عەرەبی یەکێکیان بە قەد مالیزیا و تورکیا سوودیان لە دین وەرنەگرتووە، سەرەڕای تێگەیشتنی زمانی عەرەبی و قورئان.

## منداڵان فێری شەڕو شۆڕی غەزاکان کەن وەك قورئان

کە دەڵێین ئەو دکتۆرە غەزەبە بەرهەمی هەمان کارخانەی داعشەو هەڵگری هەمان ئایدیا و بۆچوونەکانە خەڵك وادەزانێت ئێمە ئیفترای پێ دەکەین، ببینە چۆن لە جیاتی بڵێت منداڵانمان با پەروەردە بکەین لەسەر بەها جوان و مەدەنیەکان و شارستانیەکانی وەك ڕەحم وبەزەیی و ڕێزی یەکتر گرتن و ئاژەڵدۆستی و پاك وخاوێنی و مرۆڤ دۆستی، نیشتیمان پەروەری، دەیەوێت منداڵەکانمان پەروەردە بکەین لەسەر شەڕوشۆڕ و مەغازی، کە کتێبەکانی مەغازی پڕاوپڕن لە درۆ وتەهویل وموبالەغات وتاوانی گەورەی خوێن ڕشتنی خەڵك بە ناهەق، کە نەک لە پێغەمبەر [د.خ] ناوەشێتەوە، بەڵکو لە هۆلاکۆش دوورە! نەك ئەوە بەڵکوو خاوەنی کتێبەکانی المغازی وەک ابن اسحاق و الواقدي و ابن سعد بە خراپترین شێوە ڕەخنە کراون وبەدرۆزن لە قەڵەم دراون، انس بن مالك دەربارەی سەرچاوەی سەرەکی کتێبی غەزاکان ابن اسحاق دەڵێت:

(**دجال من الدجاجلة**) جادووکەرێکە لە جادووکەرەکان! کەچی کاک دکتۆر بە گریانەوە لە خەڵك دەپاڕێتەوە فێری منداڵان بکرێت ومێسکیان بە دەستی ئەو دەجەلە بشۆردرێت.

عەولواحید دەڵێت بەپێی ئەو ڕیوایەتە سەعد دەڵێت ئەوە شەڕەف و شانازی ئێمەیە منداڵەکان وەك قورئان فێرمان دەکردن! دەبیت ئەو منداڵانەی لەسەر شەڕ ومەغازی پەروەردە بکرێت، چ خاوەن دەرونێکی جەنگاوەری لێ دەربچێت؟! عەولواحید کاری داعشیەکان و دەستە خوشکانیان زۆر ئاسان دەکات، و لەجیاتی گرووپە داعشیەکان پێوەیان خەریك بن مێشکیان بشۆنەوە، باوك ودایکی کڵۆڵ لەماڵەوە منداڵەکەی ئامادە کات بۆ شەڕو شۆڕ و سەربڕین وسوتاندنی مرۆڤ و خۆ تەقاندنەوە، کە زۆربەیان لە کتێبەکانی مەغازی هاتووە! دکتۆری جەستە و پەتای میشك پێی باشترە منداڵەکانمان لەناو جەوی شەڕ وشۆڕ و خوێن بن باشترە لەوەی حەزیان لە یاری تۆپی پێ بێت یان هەر وەرزشێکی تر، چونکە لای فەرهەنگی ئیسلامی تۆپی پێ پرۆتۆکۆلاتی حەکیمەکانی جولەکە دایانهێناوە، پیلانێکە دژی ڕەوشت وئەخلاق ودین.

سەتحیەت وبێ مستەوایی عەول لەوە دەردەکەوێت کە راستە قاتێکی شیکی [عەلمانی] لەبەرە و بۆینباغێکی [بیدعەیی] بەستووە، بەڵام تەنها دۆڵێکی بەتاڵی زایەڵەی کەللە پووتەکانی سعودیە وخەلیجە وەك ئەوان دەڵێت نابێت منداڵەکانمان تەماشای کارتۆنی مشك و پشیلە بکات وەڵلا بۆ؟ چونکە مشك بەپێی ڕیوایەتە خورافیەکان لە فەواسیقە! یانی عەول واحیدیش فەتوای تەکفیری میکی ماوسی دا.

باشە منداڵ یاری نەکات، وحەز لە تۆپی پی نەکات، هیچ وەرزشێك نەکات، تەماشای کارتۆن نەکات، ئەی باشە چی بکات، بەس دەرسی گەزاکان بخوێنێت؟! دەبێت ئەو منداڵانەی لە سایەی ئەو عەقڵیەتە پەروەردە بن چ مەلا شوانێك وزەرقاویەك و بەغدادیەکیان لێ دەربچێت.

# سنورێك بۆ مەلاو بانگخوازە داعشیەکان دابنێن

## ئەی دەسەڵاتی مەست بە بۆنی نەوت

هێندە بە ترس ولەرزن بەرامبەر لۆژیکی توندڕەوانەی ئەوان، ناوێرن ڕەخنەیەکی جیدیانەیان لێ بگرن، ناوێرن بڵێن ئەو دەقانە جێگای باوەڕمان نین هەتا حەدیسێکی زەعیفیش بێت، ناوێرن بڵێن ئەو دەقانە مۆرکێکی مێژوویی پێوەیە بۆ حالەتێکی تایبەت و هەل ومەرجێکی تایبەت هاتوون نەوەك توندڕەوان بە حەوت پشت کافریان بکەن! ناوێرن ئەو ڕوحە جەنگاوەرییەی کە خەریکە سەری هەموو ئومەتی ئیسلام لە قوڕ ڕادەکات، لە دین دابڕێنن، دەبێت تەنها پاکانە و تەفسیری لاوازی جیا ببیننەوە بۆ چارەسەریان. هێندە بێ هەڵوێستن لە کاتێکدا کوردستان بەرەنگاری درندانەترین هێرشی تیرۆرستان دەبێتەوە، خەڵک بە گیان و ماڵ هەوڵی پاراستنی کوردستان دەدات، کەچی مەلا و بانگخوازە داعشیەکان وەك سەگ لە دواوە قەپ لە جەستەی گەل ونیشتیمان و پێشمەرگە دەگرن ڕۆژانە، ئەوان گوایە کاریان دینداریە، هەتا ناتوانن کەمێك دڵی ئەو مەلا و بانگخوازە داعشیە خۆفرۆشانەش بشکێنن، ڕەخنەیان لێبگرن...

ناتوانن بەرەنگاری مەلایەکی فاسست ببنەوە دەڵێت داعش بەرەی ئیمانە و لە پێناو لا الە الا اللە سێ چارەگی مرۆڤەکان بکوژین ئاساییە.

ناتوانن وەڵامی ئەو مەلایە بدەنەوە کە نیوەی ئافرەتانی کورد تەکفیر دەکات! بڵێی ئەو سکوتەیان عەلامەتی ڕەزابوون نەبێت.

ناتوانن وەڵامی بانگخوازێكی بێ بەها وبێ ڕەوشت کە پێشمەرگە خۆبی وسێ ژنەكەی و كەس وكاری دەپارێزێت لە بەكەنیزەكردنیان و بە ئاشكرا قسەیەك دەكات كە جیاوازیەكی ئەوتۆی نییە لەگەڵ قسەكانی مەلا شوانی خۆفرۆش ودەڵێت: :ئەی تۆ چۆن دەچیتە ناو سوپایەكی كوفرەوە، كە عەلەمەكەی لەوپەڕی شوعی وبێ دینیەت تیایەتی تا ئەوپەڕی نەسرانیەت و ماسۆنیەت".

من نازانم و لەوە تێناگەم، هەركەسەی دەمی دەكاتەوە لە كوردستان باسی فشارێكی زۆری ئاسایش دەكەن بۆسەر خەڵك و دەڵێن خەڵك لە ڕقی فشار وگەندەڵی ودزی وتاڵانی دەچنە سەنگەری توندڕەوان! ئەوە چ لۆژیكێكە لە ڕقی گەندەڵی وفشار بچیتە سەنگەری توندڕەوی وتیرۆرستی دژ بە میللەتەكەت؟! دیارە هێشتا ئەو خەڵكە نازانێت بە ڕێگایەكی سیاسیانە بەربەرەكانێی دیاردە سەلبیەكان بكات؟! تێناگەم بۆ ئاسایشی هەولێر و سلێمانی خەریكی گرتن و ئەزیەتدانی منداڵە ورتكەی توندرەوانن، كەچی ئەو هەموو مەلا و بانگخوازە داعشیانەی ئازاد كردوە لە ڕشتنی ژەهری تیرۆرستیان لەناو كۆمەڵگا؟! ئەوەی لەو ڤیدیۆی داعشی چاكەت وپانتۆڵ لەبەر عبدالواحید هاتوە بەڕاستی دەبوایە یەكسەر دەستگیر كرابایە وبدرایە دادگا بە تۆمەت خیانەت لە كوردستان وسوكایەتی كردن بە نائیسلامی وموسلمانەكانی كوردستان.

## كەس بەبێ حیجابی كافر نابێت، نا شارستانی

ئەو پیاوە زۆر كەس وەك كەسێكی میانڕەو و مەلایەكی شلڕەو باسی دەكەن، من دەمێكە تاقەتی گوێگرتنم لەو مەلایانەی كوردستان نەماوە، كە ئاستی وتاریان لە خوارووی ئاستی كۆمەڵگایەكی ئەفریقایی وەسەنی نا شارستانییە، ئەو مەلایە میانرەوە، بزانە چی دەڵێت بە ئافرەتان[1] . ئەو مەلایە فاتیح ناشارستانی لە جیاتی گەیاندنی مەبەستەكەی بە شێوازێكی جوان و لۆجیكیانە، دیسان وەك هەر مەلایەكی تری تورەهاتی ئەو كۆمەڵگایە، خەڵكی پێ منداڵە بە هەڕەشە دەیانترسێنێت، ئای چەند شوورەییە مرۆڤ بەس بە هەڕەشە گوێ بۆ وەكیلەكانی خوا ڕاگرێت، جاروبار دەڵێم: دەبێت ئەو ڕوحیەتە هەڕەشە ئامێزەیان هەر لە خودی دەقەكانی دینەكە وەرگرتوە، یان لە كلتوری دینیەوە.

لە سەرەتا باسی ئەو حیساباتەی قورئان دەكات ئەوەندە جارە وای گووتوە و ئەوەندە جارەش وایگووتوە، كە زۆربەی ڕاست و ورد ودەقیق نین، دەیان وتاری ڕەخنەیی لەسەر نووسراوە، من مەبەستم دوا وتەكانی بابەتەكەیە كە بە ڕاشكاوی ئافرەتان تەكفیر دەكات لەسەر بێ حیجابی! هەر لەو وتارە مەلا فاتیح دەڵێت ئەگەر ئافرەت هەموو قورئان جێبەجێ بكات تەنها سەرپۆش وحیجاب نەكات كافرە! گیان لەو میانرەوییە نزیكەی نیوەی زیاتری ئافرەتانی كورد كافر بكەیت؟! ئێمە زانیومانە قورئان دەڵێت :((**إِنَّ اللَّهَ لا يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ وَمَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدِ افْتَرَى إِثْمًا**

---

**(1)**
**https://www.facebook.com/video.php?v=795919213832914**

**عَظِيمًا))**[النساء:48]((النساو:48] خودا تەنها لەوە خۆش نابێت هاوبەشی بۆ بڕیار بدەیت، و لەوە ببەرەو ژوورتر خۆش دەبیت ئەگەر بیەوێت...چونكە شیرك سەرتۆپی تاوان و گوناهەكانە، ئەوانی تر وەك دزی، و بوختان هەڵبەستن، و درۆ، و شایەدی دان بە درۆ، و زینا، و هەتا كوشتنیش، هەموو مایەی خۆشبوونە بە پێی قورئان. من باوەڕ ناكەم نەپۆشینی حیجاب لە هیچ لەو كام گوناهانە گەورەتر بێت، بەڵكو هەر هیچ نییە لە چاو ئەواندا. چۆن؟ بی حیجاب بیت باشتر نییە لەوەی درۆزن بیت؟ بی حیجاب بیت باشتر نییە لەوەی دز بیت؟! بی حیجاب بیت باشتر نییە لەوەی بوختان هەڵبەستیت بۆ خەڵك؟! بی حیجاب بیت باشتر نییە لەوەی شایەدی بە درۆ بدەیت؟! بی حیجاب بیت باشتر نییە لەوەی گەندەڵ بیت سەروەت وسامانی ئەو وڵاتە هەژارە بدزیت؟! بی حیجاب بیت باشتر نییە لەوەی مووچەی بن دیوار وەرگریت بەبێ كار و ماندووبوون؟! بی حیجاب بیت باشتر نییە لەوەی لەگەڵ داعش سەودا ومامەڵە بكەیت و چەكیان بۆ بنیرێت بۆ كوشتنی ڕۆڵەكانی خۆمان؟! بێگومان بی حیجاب بیت باشترە لە هەموو ئەو تاوانانەی كە باسمان كردن.

ئەوە ئەگەر بێ حیجابی لە بنەڕەتدا تاوان بیت! بەڕای ئێمە بێ حیجابی ئەگەر گوناهیش بێت تەنها گوناهێكی نێوان خوا و ئەو ئافرەتەیە، نە بەوە كافر دەبێت وەك جەنابی مەلای میانڕەو باسی دەكات، نە دەبێتە دوژمنی خواش وەك لە بەشی دووەمی خوتبەكەی باسی دەكات. ئەگەر ئافرەت بەس بەبێ حیجابی كافر ببێت، ئەوە خاوەن ئەو تاوانانەی كە باسكراون لەسەرەوە كە زۆربەیان بە دەستی پیاو دەكرێت،لە كوشتن ودزی وگەندەڵی وداوێن پیسی و ناپاكی وخیانەت وهتد... هەر هەموویان كافرن! بەخوا زۆربەی مەلاكانیش بەر

ئەو کافر کردنە دەبەنگیەی مەلا فاتیحی ناشارستانی دەکەون.

## ئەگەر مەلا شارستێنی و تاربێژی میانڕەو بێت باشترە وتاردان قەدەغە بکرێت

لەو گرتە ڤیدیۆیە[2]، مەلا فاتیحی زۆر میانرەو هەر لەسەرەتاوە دەڵیت سفوری دە ١٠ بەڵاو کارەساتی لێدەکەوێتەوە [ڕاستیەکەی دە هێندە بەڵا لە عەقڵیەتی تۆدایە!] و ئەوەی گوێی لە هەڕەشەکانم بێت جارێکی تر بە سەر ڕووتی ناچێتە دەرەوە [قسەکە ئاراستەکراوە بۆ ئافرەتان] یان ڕێگا نادات کچەکەی یان ژنی و خوشکی بە سفوری بچێتە دەرەوە [قسەکە هاندانی پیاوە، ئەو پیاوەی لە سایەی داب ونەرێتی دواکەوتوو، ئەگەر بە هیچ نەوێرێت، بە ئاسانی بە ئافرەت دەوێرێت!] بزانە ئەو وتارە تەحریزیە چ توندوتیژیەکی لێ دەکەوێتەوە.

مەلا فاتیح شارستێنی ئەو هەموو سووکایەتیەی بە ئافرەت دەکات، بێ ئەوەی مفتەخۆرانی دەسەڵات و وەزارەتی ئەوقاف و ئەنجوومەنی باڵای خانمان و ڕێکخراوەکانی ئافرەتان لیی بە وەڵام بێن! ئەو تۆمەتە ترسناکانەی مەلا فاتیح شارستێنی دەیداتە پاڵ ئافرەتی سفور، هاندەرێکی ئاشکرای توند وتیژیە بە دژی ئافرەتانی سفور، بۆ داپلۆساندنیان لەلایەن برا وباوک و مێردەکانیان وتەواوی کۆمەڵگای دواکەوتووی کورد، کە زۆربەیان فەرهەنگیان لە دەمی مەلا

---

(2)https://www.facebook.com/video.php?v=796605393764296&set=vb.303702429721264&type=2&theater

داعشیەکانی ئەمسالی مەلا فاتیح شارستێنی و سوسەیی و عەبدولسەمەد و دکتۆر عبدالواحید محمد ومەلا هاوڕێی دەجال شانامەیی و باقی مەلاکانیتر وەردەگرن. ئەو وتارە لە هەر وڵاتێک بوترێت خاوەنەکەی تووشی لێپرسینەوەی دادگا دەبێت. نازانم وەزیری ئەوقاف چەند کەسی پسپۆری هەیە چاودێری ئەو وتارە توندوتیژ ونا شارستانیانە بکات؟! یان وەزارەت بەس پشکی حزبە وکەس پرسینەوەی لێ ناکات هەرچەندە کڵۆڵ بیت.

ئێمە چۆن لەو کۆمەڵگایانەی دژایەتی حیجاب دەکرێت رازی نین مافی تاکەکەسیان پێشێل بکرێت بە هەمان جۆر دژی ئەو جەنگەین، کە مەلا فاتیح شارستێنی جاڕی داوە لە دژی ئافرەتی سفور و تۆقاندنیان و هاندانی کەس وکاریان لە دژیاندا. سەیر لەوەدایە لە کوردستان بە جیا لە زۆربەی وڵاتانی تر جیاکاری ناکرێت دژی ئافرەتی حیجاب پۆش، کەچی مەلا بێ کۆنترۆڵەکان هێشتا ڕازی نین بەو لێبوردەییەی دەسەڵات وکۆمەڵگا، ئەوان هێرش دەکەنە سەر ئافرەتی بێ حیجاب وکافر ومەلعون ومونافیقیان دەکەن، لە پاش ئەو حوکمانە کوشتنی هەر ئافرەتێکی سفور بە دەستی گەوجێکی ئیماندار فریوخۆر بە دەستی ئەو تەرزە مەلایانە، دەبێتە کارێکی پاڵەوانانە، چونکە تۆ كەسێك دەکوژی کافرە، مەلعونە مونافیقە، جاڕی جەنگی داوە لە دژی خودا! وەك لە وتارەکانی مەلا فاتیح شارستێنی هاتوە.

مەلا فاتیح شارستێنی بە عەقڵیەتێکی گوندنشینی کوردی و بیابانشینی عەرەبی وەهابی ئەوەی خراپە دژی ئافرەتی دەڵێت وخەڵك وکۆمەڵگایان لێ هان دەدات. لەلای ئەو ئافرەتانی سفور بەپێی دەق و ئەحادیسەکان:

-خراپترینی ئافرەتانی ناو كۆمەڵگاكەمانن " شر نسائكم المتبرجات"!

-دوژمنایەتی خوا دەكەن وئیعلانی جەنگیان كردوە لەگەڵ خوا و پێغەمبەر!

-كافرن، و مەلعونن! العنوهن فانهن ملعونات!

-سفورەكان هەمووی مونافیقن! " شر نسائكم المتبرجات المتخیلات وهن المنافقات"

-سفوربوون یەكسانە بە دزی و داوێن پیسی و هاوبەشی پڕیاردان بۆ خوا! چونكە لەدوای یەك لە حەدیسێكی بێ بنەما هاتوون!

-جیاكاریان لە دژدا دەكات و دەڵێت: كوڕان ئامان خۆت بپارێزە لە ئافرەتێك كە لەعنەتی لێكرابێت! ئافرەتێك كە مونافیقە بێت. ئەگەر ژنت هێنا توخوا ئافرەتی سەر رووت و قاچ ڕووت نەهێنیتە ماڵەوە!

-سفووربوونی ئافرەتان هۆی سەرەكی زیادبوونی رێژەی تەڵاقە، ئەوانەی تەڵاق دراون هەمووی مونافیقاتە! دەڵێت: "الحمدلله ٩٩% بە شاهێدی دادگاكان سفورن! " نازانم دادگاش ئاماری بڵاوكردۆتەوە، یان مەلا چۆنی زانی ڕێژەی سفور وموحەجەكان چەند بووە؟!

-ئەوەی خۆداپۆشە کوردێکی ڕەسەنە، ئەوەشی سفورە لە کوردایەتی ومیللەتی خۆمان لایداوە؟!

ئەو مەلایە میانڕەوە هێندە ساویلکانە دەڵێت: "ئەوەی حیجابی لەبەردا نیە هیچ عوزرێکی نییە، چونکە هیچ ماندوو بونێکی تێدا نییە، چونکە هیچ نەخۆشیەك مانعی نییە"!

ئەخر مەلا و قسەکردنیان نە وتوە لەسەر ئەو بابەتە کۆمەڵایەتیە هەستیارانە، دەڵێی لە گوێی گای مێژوو دەژیت، نازانی ئافرەتیش مرۆڤە وهەق ئازادی هەڵبژاردنی هەیە، دەیەوێت ببیتە حیجاب یان نا؟ نازانێت بەو هاندانەی پیاوە بێ فەرهەنگەکان ماڵەکان دووچاری گەورەترین توندوتیژی و زۆرەملێی دەکاتەوە، نازانێت هەزاران کچ لە ئەساسدا کێشەیان هەیە لەگەل کەسوکاریان کە نایانەوێت حیجاب بە زۆرەملێی بپۆشن! نازانن هەزاران کچ هەن تەمەنای مردنی باوك وبرای خۆ سەپێنەریان دەکەن، کە بەزۆر لەچکیان کردونەتە سەر، دەچێت نمونەی بەر لە سەد ساڵی لادێکانی کوردستانم بۆ دەهێنێتەوە! کورد لەو سەردەمە وا جاهیل ونەزانانە دوای دەیان مەلای وەك تۆ و لە تۆش توندرەو وتەکفیریتر کەوتوون، دەبیت ئەو سەردەمە چۆن بووبن؟ دەشڵێت ڕێژەی تەڵاق بۆ زۆر بووە؟! ڕێژەکە لەبەر هاندانی مەلای وەك ئێوە زۆر بووە بۆ پیاوان لە دژی ئافرەتان و ڕێزنەگرتنی هەڵبژاردەیان! تەڵاق لەبەر ئەوە زیادی کردوە تۆ ئافرەتی بێ حیجاب بە شەیتان دەکەیت و کافر ومەلعون و مونافیقیان دەکەیت، کە ئەو حوکمە کوێرانەت لە توندڕەوترین مەزهەبی ئیسلامدا نەهاتووە، هەتا لە سعودیەی وەهابی سەلەفیشدا.

## زنجیرەی تۆقێنەرەکان

لە حەدیسزانیدا ئەو زنجیرەیەی کە حەدیسەکە دەگێڕنەوە دەم بۆ دەم، کە دەلیت [**عن متوهم عن غیر متأکد عن ضائع عن کاذب عن صائع**] دەڵێن سەنەد و سلسلەی حەدیس، زنجیرەی گێڕەرەوەکان.

لە کۆمەلگا ئیسلامیەکان، زنجیرەیەکی تر لە سایەی ئەو مەلا بەڵایانەی کە کاریان بەس ژەهراوی کردنی دڵ ودەروون ومێشکی ئەو ئومەتەیە، دروست بووە کە زنجیرەی تۆقیوەکانە. یەکەم بنچینەی ئەو زنجیرەیە لەسەر دەقگەلێکی توند وتیژ بنیات نراوە، کە پڕیەتی لە قەسوەت وکوشتن وبەتاڵان بردن و بە کەنیزەک کردن و جوێن و هەڕەشە وسوتاندن و سەربڕین.

ئەو دەقانە لەلایەن کاهینەکانی میحرابی توندرەوی باش لەبەر کراون و بەکاری دەهینن لە دەرس و وتارەکانیان و سیمنارەکانیان! کۆمەڵگای ناهوسیار و خەوتوو زۆرترین کاتی بۆ قسەکردنی و گوزارش کردنی ئەو بیروڕایە تەپیو و تۆقینەرانەی ئەو مەلایە بەڵایانەی تەرخان کردوە، بە وتاری هەینی و دەرسی مزگەوت وبەرنامەکانی تیڤی و رادیۆ و سیمنار وکۆڕ.

بۆیە ئەو بیرە تۆقێنەرە بە خۆشحاڵیەوە دەگوازرێتەوە بۆ کادیرانی حزبی دینی و دیندارە نەخوێندەوەراکان و منداڵکارە بی فەرهەنگەکان، وئافرەتە بێ سەوادەکان! ئەوانیش هەر بە خۆبەخشی دەبنە پاسەوانی ئەو بیروبۆچوونە تۆقینەرانەی مەلابەڵاکان ولە جیاتی ئەوانیش پارێزەری لێدەکەن بە قەد کەرەکەی قانیع ڕەزان! لە سایەی ئەو دەسەڵاتەی کە ئەو هەموو کاتە تەرخان دەکات بۆ قسە وبیرە تۆقینەرەکانی ئەو مەلا بەڵایانە، زۆربەی کۆمەڵگا ڤایرۆسی تۆقینەری دینی هەڵدەگرن، تەنها نوخبەیەکی کەم نەبێت، و بەشێکی کەمی چینی مامناوەندی نەبێت کە نا ڕازیە لەو جەوە تۆقێنەرە! ئەو بەشەش کە نارازین، بەشێکیان بوێرانە لێیان دێنە دەنگ و تا سەر ئێسقان دژی ئەو بیروباوەڕە تۆقێنەرانە دەوەستنەوە، چەند کەسێکی ئازادی بوێر نەبێت، دەنا کەس ناوێرێت پشتگیریشیان لێ بکەن، هەتا ئەگەر سەد لە سەد پشتگیری بیروباوەڕیشی بکەن.

بەشەکەی تر نارازی لەو وەزعە کە بەشی هەرە گەورەیە، زۆربەی ژیانیان بە ترس ولەرز دەبەنە سەر بە دزی ولە نێو دڵی خۆشیان ناوێرن ڕەخنە لەو زنجیرەیەی تۆقینەران بگرن، هێندە ترسنۆك و خۆپەرستن نەك ناوێرن پشتگیری لە داکۆکیکاران بکەن لە مافەکانیان و مافی مرۆڤ بە گشتی لە دژی ئەو مەلا جرِ وجانەوەرانەی ئەشکەوتەکانی جەزیرەی عەرەبی، بەڵکو زۆرجار بە ناچاری ماستاو و ڕیکاریش دەکەن بۆ زنجیرەی تۆقێبەرەکان، وبەبێ دەنگیش ناوەستن، بۆ سەلماندنی ملکەچی وملشۆڕییان بۆ کاهینەکانی توندڕەوی و زنجیرەی تۆقێبەرەکانیان قسەش بەو نوخبەیە دەڵێن کە بەرگری لە مافەکانی ئەوانیش دەکات وبە ناچاری دەبنە ئەڵقەیەك لە زنجیرەی تۆقێنەرەکان! ئەو

میانرەوە دەبەنگ و ترسنۆکانە نووسەرێکی عەرەب جوان ناوی ناون بە [الابلە المفید] واتە دەبەنگی سوودلێکراو.

## مەلاکانی کوردستان و چیرۆکە سەرەڕۆکانی نیقاب و حیجاب

مەلا واعیزەکان چیرۆککگەلێکی پراوپڕ لە هەڵوێستی توندرەوی و بی مانای کۆمەڵگای لادێیی کوردستانی پێش پەنجا وسەد ساڵ دەگێرنەوە، یان چیرۆکی لادێ نشینەکانی بەنگلادیش وسعودیە وپاکستان...هەمووشی باسی ڕەوشت وئاکاری ئەو سەردەمە دەکەن، کە خەڵک چەند باش وبەدین و بە ڕەوشت بوون، هەموو چیرۆکەکانیس هاندانی سەختگیریەکی سەلەفی بێ مانا دەکات، ولە دەوری لینگی ئافرەت و حیجاب و نیقابەوە دەسوڕێتەوە! مەلایەک دەڵیت: ژنێکی ڕوسی چونکە بوە موسڵمان بۆ نوێکردنەوەی پاسپۆرتی، رەسمی بە نیقابەوە گرت، یانی یەك پارچە ڕەش، لۆشی چوە سەر و بە زەبری شەونوێژان، چونکە جائیز نیە دەموچاوی دەرخات! ئەو مەلایە قارەمانی تەلەفزیۆنی یەککگرتووی میانڕەویشە.

مەلا فاتیح شارستێنی، لە ڕاگەیاندنی جەنگی لەدژی ئافرەتی بێ حیجابدا، چەند چیرۆکی حیجابی دەگێڕێتەوە، لە یەکێکیان باسی ژنێك دەکات کە لە

لادێیەك لە كاتی گەرانەوەی لە كانی، سەرشانی جلەكەی دڕاوە وپێستی شانی بەدەرەوە بووە، پیاوێك تورە بووە وبانگی كردوە بۆ شانت رووت كردوە. كوا دین، كوا ڕەوشت؟! ئەویش دەڵێت پارچە كوتاڵێكم دەست نەكەوت پینەی بكەم! دیارە سەردەمی پێش دۆزینەوەی كاغەزبوە! كابراش كەوا نوێكەی دەبڕێت بە چەقۆ و دەڵێت برۆ بەوە پینەی بكە، نەك حەیامان بچێت.

یا پیاوێك جوانە گایەك لە خۆی نەزر دەكات، كاتێ لەناو مەجلیسی مێوانان دانیشتوە، وبا هەڵیكردوە نەوەك با كراسی بووكەكەی هەڵدات و قاچ و لینگی بەدەركەوێت! چیرۆكەكانیان هەمووی لەسەر ئافرەت دەسوڕێتەوە، وەك بڵێی پیاو كاملوموكەمەل بن! یان وەک بڵێی لە ژندا هیچ سیفەتێك وبەهایەك گرنگ نییە بە قەد حیجاب و خۆداپۆشین! بۆیە لەناو هەزاران ئافرەتی حیجاب، بەدەگمەن نەبێت كەسێكی نمونەیی وعاقڵ وهوشیاری وا نابینیتەوە كە كەمێك دڵت پێی خۆش بێت! چونكە ئەو دەزانێت وتاری دینی تەقلیدی سەقەت بەس چاوەڕێی ئەو پارچە قوماشە لەو دەكات، پاش ئەوە گرنگ نییە، درۆزن دەبیت، دڵ ڕەق دەبیت، بێ زەوق دەبیت، نامرۆڤ دەبێت.

هەر بۆ بەراورد، بۆ نمونە دەیان گرتەی ڤیدیۆیی هەیە كە ئافرەتی سفوری خۆرئاوا بەرگری لە ئافرەتی موحەجەبە و مونەقەبە دەكەن، لەبەرامبەر كەسانێك كە سوكایەتیان پێ دەكات. كەچی ببینە لەو كوردستانە، مەلا بەڵاكان باسی ئافرەتی سفور دەكەن وەك شەیتان، وەك جولەكەكانی سەردەمی نازیەكان، هەزار سوكایەتیان پێ دەكەن، ببینە ئەو هەموو ئافرەتە زۆر و بۆرە موحەجەبەیەی حزبە ئیسلامیەكان و سەربەخۆكانیش، یەكێكیان هەڵوێستێكی ئینسانی وەردەگرن، یان بەرگریەك لەو دەستە خوشكانەیان دەكەن؟! ئەوە لە كاتێكدا هەیانە خوشكیان، یان كچی مامیان، یان ڕەفیقیان، یان هاوپۆڵیان

سفورن؟! کە ناشی کەن چونکە عەقڵیان پەك خستووە و مێشکیان لە مستی مەلا تورەهاتەکانە.

با چیرۆکێکی عاتیفی وەک فیلمی هیندی تان بۆ بگێرمەوە کە خوێندمەوە، لە سایتێکی ئیسلامی، ئەویش لەسەر حیجاب و نیقابە! چیرۆکەکە شێخ ئەحمەد الصویان دەگێرێتەوە کە لە بەنگلادشی پێشکەوتووەوە! دەڵێت چومە بەنگلادش لەگەڵ تیمێك بانگخوازی ئیسلامی پزیشکی، بۆ چارەسەری نەخۆشیەکانی چاو، پیرە پیاوێك هات لەگەڵ ژنەکەی کە بە دوو دڵی هەنگاوی دەهاوێشت، کە دکتۆر لە ژنەکەی نزیك کەوتەوە بۆ پشکنینی، ژنەکە دەگریا و وەک شۆڕە بی دەلەرزی! دکتۆرەکە وایزانی لەبەر ئازاری نەخۆشیەکە وا دەلەرزێ و دەگری! بە مێردەکەی گووت بۆ دەگری؟! گووتی: لەبەر ئەوە دەگریت کە ناچار دەبێت دەموچاوی نیشانی پیاوێکی بێگانە بدات! لە دوێنێوە لەبەر نیگەرانی ئەو گوناهە نەخەوتوە، وگلەیی لەمن دەکات کە چۆن ڕازی دەبیم و غیرەتم قبول دەکات دەموچاوی دەرخات!!! دوایی پاش ئەوەی دنیایەك بەڵگەیان بۆ هێناوەتەوە کە گوناه نییە دەموچاوی خۆی دەرخات بۆ چارەسەری، خوا ڕێی پێداوە، ئینجا ڕێگای دا، و پاش نەشتەرگەری چاویشی هەردوو کرایەوە! بەڵام مێشکی هەرداخراو مایەوە، چونکە بە مێردەکەی دەگووت: ئەگەر لەبەر خوێندنەوەی قورئان و خزمەت کردنی تۆ و مناڵەکانت نەبا پێم باشتر بوو بە کوێری بمێنمەوە و نەك پیاوێکی بێگانە دەموچاوم ببینێ!!! ئەوە ژنی پیرەمێردێک بووە، لەوانەیە خۆشی پیرەژنێك بوو بێت! کابرای چیرۆك خوان دەڵێت: دەبروانن خوشکان بۆ عیفەت و ڕەوشتبەرزی لە جوانترین شێوەیدا، تەماشا عیزەت بکە بە ڕووە گەشەکەی!! ئەوە لە کاتێکدا دەموچاو داپۆشین لە دینیشدا نەك واجیب نییە، بەلکو سونەتیش نییە.

## حیجاب یەکەمینی یەکەمەکانە

لە کۆمەڵگا ژەهراوی بووەکان بە فەرهەنگی توندرەوی دینی، ئافرەت ئاسانترین نێچیر و ئاسانترین ئامانجی ئەو کۆمەڵگا پیاوسالارەیە، کە هەموو تورەیی وخەشم وقینی لە دەرنجامی نوشوستی و بێ دەسەڵاتی و کەموکورتی ژیان و بێ کاری و جەوروستەمی دەسەڵات کە لێی دەکرێت لە ئافرەتدا خاڵی دەکاتەوە! هەتا چەورە وبی دینی کۆمەڵگاش پەیرەو لەو ئەتوارەی دژی ئافرەت دەکەن.

لە فیکری دینی بە گشتی و سەلەفی بە تایبەتی، سفور بوون لە نیشانە بچووکەکانی ڕۆژی قیامەتە، لەو ڕێگایەوە پشت بە چەندین قالە و قیلە دەبەستن، کە زادەی عەقڵیەتی بەدەوی دژە ئافرەتی عەرەبن! بەجۆرێک باسی ئافرەت دەکەن، وەك بڵێی سێ چارەگی کێشە ودەردەکانی ئومەتی ئیسلام لەبەر سفوری ئافرەتانە.

ئەو عەقڵیەتە تەهویلیە و زیادەرەویە خورافە ئامێزە هێندە ناسەنگە کێشەکانی لێ تێکەڵاو دەبێت، ونازانێت چۆن ریزبەندی وئەولەویەتی بۆ دابنێت.

لای ئەو هەموو کێشەکانی بێکاری و تەندروستی و خۆشگوزەرانی و گەندەڵی و تالانی سەروەتی کۆمەڵگا دەگەڕێتەوە بۆ سفووری ئافرەت.

لە ئێران تیزاب بەو کچانە دادەکرێت کە حیجابەکەیان باس نابەستن بە هاندانی دەزگا ئاسایسەکانی ئێران!
لە شیسان قەدیرۆفی بەکرێ گیراوی ڕووس، کە لەلایەك شەڕی توندرەوانی دینی شیشان دەکات، کەچی پشتگیری لە هێرش کردنە سەر بێ حیجابەکان دەکات بە تۆپەڵە بۆیاغ.

لەکوردستان مەلا شارستینی و غەیری ئەو وا ئافرەتی بێ حیجاب دەتۆقینن، بە سەدان تۆمەتی کوفرو نیفاق و هاوتای داوێن پیسی و لەعنەت لێکراو لە لایەن خواوە تۆمەتبار دەکەن.

مەلا شارستێنی لە جیاتی جەنگ لە دژی گەندەڵی و ناعەدالەتی و کەموو کورتیەکانی تر بکات، کەچی بڕیاری جەنگی داوە دژی ئافرەتی کوردی بێ سەرپۆش.

مەلا شارستێنی دەبوایە خۆی وتارێکی دابا لەسەر ئەو جاش و مستەشارانەی کە کاتی خۆی ئەنفالیان کردوە دژی ژن ومنداڵ وپیری کورد، لە جیاتی ئەوە خۆی لە مزگەوتی یەکێك لە گەورە جاشانی ئەنفالچی وتارەکانی دەدات! بەس بە ئافرەت دەوێرن، چونکە کۆمەڵگا سەقەتەکەمان نا مرۆڤانە دەڕوانە ئافرەت کە نیوەی تەواوکەری مرۆڤایەتین.

شارستێنی دەڵێت ئەو ئافرەتەی خۆی دانەپۆشێت ونەبێتە موحەجەبە ئیعلانی حەربی لەگەڵ خوا كردوە[3]، چونكە خوا دەڵێت خۆت داپۆشە ئەو دەڵێت خۆم داناپۆشم! ئەو مەلا لادێیە هەتا ئاگادار نیە بە غەریزەی حەزكردنی ئافرەت لە جوانی! هەتا نازانێت چەندە بریارێكی قورسە بۆ ئافرەتێكی خاوەن كەسایەتی بەهێز، نەك مەڕومالاَتەكان، بریاری حیجابكردنی بدات.

ئەوە عەقڵی مرۆڤێكی خوایی و ژیر نییە، كە بازبدات بەسەر هەموو كارەساتە گەورەوكانی كۆمەڵگا لە تالانی و دزی گەندەڵی و ناعەدالەت بەلاَت دنیا لەو حیجابە كۆبكاتەوە؟! ئەوە هەستی پیاوسالارانەیە هانی دەدات چاوپۆشی لەو هەموو خەراپەكاری وگەندەڵی وخیانەت و داوێن پیسی و دزی وتالان وبرۆ بكات ئاوڕداتەوە بۆ لاوازترین ئەڵقەی كۆمەڵگای داپلۆسێنەر، كە ئافرەتە! من نازانم ئەگەر خۆداپۆشینی ئافرەت هێندە گرنگ با، بۆ ئافرەتە كۆیلەكان قەدەغە دەكران لە خۆداپۆشین لە سەردەمی پەیامدا، نەوەك خەڵك حیسابی ئافرەتی ئازادیان بۆ بكات؟! بۆ پیاو حەزی بۆ ئافرەتی كۆیلە ناجوڵێت؟! بۆ كۆیلەكانی كچانی فارس و كورد و ڕۆم و چەركس و قیبت و گورجستان چما زۆر لە كچانی جەزیرەی عەرەبی جوانتر نەبوون.

مەسەلەی نەهێشتنی سەرداپۆشینی ئافرەتی كۆیلە زۆر كۆنە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئاشوریەكان، كە ئەو ئافرەتە كۆیلەیەی حیجابی كردبا جەڵدەی لێدەدرا! لەوێوەش پەڕیەوە ناو فقهی ئیسلام، هەتا ڕیوایاتێكی زۆر هەیە دەڵێن

---

**(3)https://www.facebook.com/video.php?v=796605393764296&set=vb.303702429721264&type=2&theater**

حەزرەتی عومەر توڕە دەبوو لەو ئافرەتە کۆیلانەی سەرپۆشیان دەکرد چونکە خۆیان بە ئافرەتی ئازاد دەچواند!!

کەی ئەوە شیواز و ئەتواری مەلایەکە خۆی پی میانڕەوبێت، کە وەك ڕوکنێکی ئیمان وئیسلام باسی سەرپۆش بکات؟! چۆن دەتوانیت بڵێیت ئەو ئافرەتەی خۆی دانەپۆشێت ئیعلانی حەربی کردوە لەگەڵ خوا و پێغەمبەر؟! چۆن هەتا باڵاپۆشی بەراورد دەکرێت لەگەڵ نوێژ وڕۆژوو کە ئەوانە لە ئەرکانەکانی ئیسلامن، بەڵام حیجاب چەند ئایەتێکیناموحکەمی لەسەر هاتووە، هەتا تەفسیری جۆراوجۆریش هەڵدەگرێت.

سەیر لەوەدایە هەندێك سفوری دەبەنگیش توشی ستۆکهۆڵم سیندرۆم بوون، بەرگری لەو پیاوە دەکەن کە کافر و مەلعون و مونافیقیان دەکات.

لە کۆمەڵگای دواکەوتوو کێشەکانی هەژاری، و بێکاری وگەندەڵی، و پەروەردەوفێرکردن، و بیمەی تەندروستی، و مافەکانی مرۆڤ، و نیشتەجێ و ژێرخانی وڵات هەمووی پشتگوێ دەخرێت، حیجاب وهیستریای حیجاب دەبێتە یەکەمی یەکەمەکان.

# ئيسلام وەك ئاينێكى جەنگاوەر

# بەشى يەكەم

## ئيسلام وەك ئاينێكى جەنگاوەر

چونكە ئيسلام لە بنەڕەتدا وەك دينێكى جەنگاوەرانە هاتە ئارا، بۆيە موفرەداتى شەڕ و جيهاد و شمشێر و غەزوو وتوندوتيژى ڕەگێكى دوور ودرێژى داكوتاوە لە كۆى ئيسلام ومێژووى ئيسلامدا، وبە ئەنجاميش لە دەروونى تاكى موسڵماندا. دينى جەنگاوەر مەبەستم لەو دينەيە كە تەنها بە بانگەوازى ئاشتيانە و بە دەعوە و قسە بۆ خەڵك كردن بڵاونەبوبێتەوە و خۆى

نەپاراستبێت، بەڵکو بێ هێزی و بانگەوازی تەنها لە قۆناغێکی کاتی نواندبیت، وەك قۆناغی مەککی، ولە قۆناغی مەدەنی دواتر خۆی پڕ چەك کردبیت بۆ پاراستنی خۆی و دوایی بۆ پەل هاوێشتنی. دینی یەهودیەت یش ئەو سروشتە جەنگاوەریەی هەیە، زۆربەی پێغەمبەرانیان حاکم و فەرمانرەوای دەوڵەت وسوپا بوون و وەك ئیسلام دیانەتگەلێکی جەنگاوەر بوون. بەڵام مەسیحیەت و بودایەت بۆ نمونە دوو دیانەتی تەبشیرین و بە تەنها بانگەوازیان بەکار دەهێنن بۆ بەردەوام بوونیان، هەرچەندە مەسیحیەت خیانەتی لێکرا لەسەر دەستی پاپا و کاهینەکانی کە لە دیانەتیکی بانگەوازیەوە گۆڕیان بۆ دیانەتیکی جەنگاوەر.

لەو باسەدا، من باسی ستەمکار و ستەملێکراو، دەستدرێژی کەر و دەستدرێژی بۆسەرکراو ناکەم، چونکە ئەوە بابەتێکی ترە، خودی ئیسلام دیانەتێکی تەبشیری ڕووت نەبوو لە بەکارهێنانی چەك وهیز وەك دینەکانی تر، کە تەنها بە بانگەوازی کردن هەوڵی بڵاوبوونەوەیان دەدا، چونکە لە بنەڕەتدا ئیسلام وەک دینێکی شمولی و کودەتایی و یەکلاییکەرەوە هات و هیچ بژاردەیەکی بۆ کۆمەڵگای عەرەبی قورەیشی مەککە نەهێشتەوە جگە لە ڕووبەڕوو بوونەوە. لە کۆی بڵاوبوونەوە و باڵکێشانی ئیسلام بەسەر جەزیرەی عەرەبی و شەڕەکانی پێغەمبەر [د.خ] و قورەیش و هۆزە عەرەبیەکانی تر، وشەڕی لەگەڵ هۆزە جولەکەکان و هەموو غەزەواتەکان کە ژمارەیان ٢٩ شەڕ وغەزوەیە و سەرەڕای ٣٨ بەعسە وسەریە ناردن بۆ شەڕ. ئەو هەموو شەڕ وغەزەواتانە بێگومان کاریگەری دەبێت لەسەر دەروونی مێژوویی ومیزاجی دینداری تاکی موسڵمان، بە زانا و خەڵکی ئاساییەوە، ودەبێتە سەرچاوەیەکی ئیلهام و سرووشی موسڵمانان، بە تایبەتی ئەگەر شەڕ و فتوحاتە دینیەکانی تری دەوڵەتی خەلافەتی ڕاشدین و ئەمەوی وعەباسی وهتد، بخەینە سەر، هەروەها شەڕە تایفیەکانی تری

خەواریج و موعتەزیلە و شیعە وسونە وخاچ پەرستەكانیش . وەك گووتم من باسی ڕەوایەتی وناڕەوایەتی ئەو شەڕانە ناكەم، بەڵكو زیاتر باسی دامەزراندنی نمونەیەكی دینی جەنگاوەری دەكەم، كە دەق بە پێچەوانەی دینە تەبشیریەكانی تر بوە وەك مەسیحیەت لە لایەنە تیۆریەكەیەوە بەلایەنی كەم، كە هانی شوێنكەوتانی دەدات بە ئەوپەڕی سەبر ودان بەخۆدا گرتن بەرامبەر ناحەزان و دوژمنانیان، هەتا ئەگەر شەقێكیان لە ڕووی ڕاستیان دا، دەبێت ڕووی چەپیشی بۆ هەڵسوڕێنیت! هەروەها خاڵێكی تری مەسیحیەت وەك دیانەتێكی تەبشیری جیای دەكاتەوە لە دیانەتێكی جەنگاوەری وەك ئیسلام بریتیە لە مونافەسە نەكردنی دەسەڵاتداران لەسەر حوكم و گرتنە دەستی جڵەوی دەسەڵات، [ئەوەی خوا واز لێبینە بۆ خوا، ئەوەشی بۆ تزار بۆ تزار] هەرچەندە مەسیحیەت لەسەر دەستی پاپاكان وكاهینەكانی ئەو دوو خاسیەتە گرنگەی خۆی لە دەستدا، ئێستا لە پاش ڕێنیسانس و شۆڕشی پیشەسازی لە ئەوروپا، چۆتەوە قەبارەی جارانی خۆی، بەبێ شەڕ و بێ كێشمەكێش كردن لەگەڵ فەرمانڕەوایان كاریگەریەكی زۆر بەهێزی هەیە لەسەر ژیانی سیاسی و كۆمەڵایەتی خەڵك.  هەتا دینی جولەكەش ئەو خاسیەتەی هەوڵدان بۆ حوكمی دینی تا ڕادەیەكی زۆر لە دەست داوە، ئەگەرچی بۆتە سەرجاوەی ئیلهام و سروشی زایۆنیزم، كە ئەفسانەكانی جولەكە وتەورات بەكار دەهێنێت لە پرۆژەكانی.

## عیبادەت یارییە لە چاو جیهاد

لە ئیسلامدا، جگە لە بەشێكی زۆری ئەهلی تەسەوف نەبێت، هەموو ئەوانەی كە هاتوون لە ئیمامەكان و زانایان و مەزاهیبەكان و موفەسیرەكان و موحەدیسەكان و فەقیهەكان بە ڕادەیەكی زۆر كاریگەری ئەو لایەنە جەنگاوەریەی ئیسلامیان پیوە دیارە لە شێوازی بیركردنەوە و قسەكانیان و فەتواكانیان و

هەڵسەنگاندنەکانیان و شەڕوکردەوەکانیشیان. ئەو شیعرە بەهێزەی عبداللە بن مبارك بە چاکترین شێوە گوزارش لەو ڕوحە جەنگاوەریەی ئیسلام دەکات، کە عبداللە کوڕی موبارەك وەك نامە بۆ فضیل بن العیاض نارد، تیایدا ئەو ڕوحە جەنگاوەرە دەخوێنینەوە کە لە چاو جیهاد دا گاڵتەی بە عیبادەتی عابیدێکی ناوداری وەك فضیل دێت، ئەو قەسیدەیەی کە ڕۆژانە لەسەر مینبەرەکان دەیڵێن و دەیڵێنەوە ، بەچاکترین شێوە گوزارش لەو ڕوحە جەنگاوەرەی ئیسلامدا دەکات، کە دەڵێت:

يا عابدَ الحرمين لو أبصرتَنا... لعلمتَ أنَّكَ في العبادةِ تلعبُ

مَنْ كانَ يخضبُ خدَّه بدموعِه... فنحورُنا بدمائِنا تتخَضَبُ

أوكان يتعبُ خيله في باطل ...فخيولنا يوم الصبيحة تتعبُ

ريحُ العبيرِ لكم ونحنُ عبيرُنا... رَهجُ السنابكِ والغبارُ الأطيبُ

ولقد أتانا من مقالِ نبينِا... قولٌ صحيحٌ صادقٌ لا يَكذبُ

لا يستوي غبارُ أهلِ الله في... أنفِ أمرئٍ ودخانُ نارٍ تَلهبُ

هذا كتابُ الله ينطقُ بيننا... ليسَ الشهيدُ بميتٍ لا يكذبُ

**ئەی خواپەرستی ناودووحەرەم ئەگەر دەمان بینیت.....دەزانی تۆ لە عیبادەتەکانتا خەریکی یاری کردنی**

ئەوەی ووەتی بە فرمێسکەکانی تۆ دەبێت....ئەوا ئێمە ناوقەدمان بە خوێنمان

سوورهەڵدەگوێت

یان ئەوەی ئەسپی لەناهەقدا ماندووو تاودەدات.....ئەسپەکانی ئێمە هەر

لەبەرەبەیاندا ماندووە

بابۆنی خۆشی عەبیر بۆ ئێوە بێت، عەبیری ئێمە.....چەخماخەی قاچی ئەسپەکانە

وبۆنی تۆزوخۆڵ لای ئێمە پەسندترە

قسەی پێغەمبەرەوپێمان گەیشتووە....قسەیەکی ڕاست ودروست ودوور لە

درۆ

تۆزوخۆڵی پیاوانی خوا یەکسان کۆنابێتەوە لە....لووتی کەسێك لەگەڵ

دووکەڵی ئاگرێکی بڵیسەدار

[ئاماژەیە بۆ فەرمودەی: لا يجتمع غبار في سبيل الله في منخر عبد ودخان

جهنم]

ئەوە تەکتێبی خوا داوەریمان دەکات...کەشەهید مردوو نیەو درۆ ناکات

ئاماژەیە بۆ چەندین ئایەت بۆ نمونە:{ وَلا تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَمْوَاتاً بَلْ أَحْيَاءٌ عِنْدَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ } [آل عمران:169]

سەیر لەوەدایە ئەو قەسیدەیە ناوداره کە لە دەیەها کتێبی تەفسیر وحەدیس و مێژوو باسی کراوە وبۆتە کەلەپۆرێك، دەیەها زانا و دیندار بە نمونە دەیهێننەوە، هەتا درۆ و هەڵبەستراویش بێت کاری خۆی کردووه، کەچی ئێستا و تازه بە تازه دەڵێن ئەو حەدیسە لاوازه لە ڕووی سەنەد ومەتنەوە! و دەڵێن ماقول نیە کەسێکی وەك عبدالله بن المبارك عیبادەت بە یاری بشوبهێنێت! ئەو حەدیسە لە سەنەدیش لاواز بێت ئەوە لە مەتن هەرگیز لاواز نییە، چونکە سەدەها دەق هەیە لە قورئان و سونەدا لە کۆی گشتیدا ئەو مانایە دەبەخشێ، کە هیچ عیبادەتێك ناگاتە جیهادکردن لە پێناو خوادا، هەتا لە سونەتدا عیبادەتەکانی هەشتا ساڵ بە شەوێک لە شەوەکانی ئێشکگیری جیهاد یەکسان دەکات! بۆیە بەڕای من ئەو قەسیدەیە زۆر بە وردی وبلیمەتی گوزارش دەکات لەو ڕووحە جەنگاوەرەی دینداری موسڵمان کە گاڵتەی بە تقوس و ڕێکاره ئاینیەکان دێت لە بەراوردا لەگەڵ ئەو فەزڵەی جەنگاوەر لە جیهاددا دەستی دەکەوێت.

## ڕوحی جەنگاوەری لە قورئاندا

لە دەقەکانی ئیسلامدا کە هێندە زۆرن ناکرێت باسی هەموویان بکرێت زۆر بە بەرزی و بە دنەدانێکی ئاشکرا و ڕاشکاوەوە باسی گەورەیی جیهاد و موجاهیدان و شەهیدان دەکرێت. لە قورئاندا بەو شێوەیە باسی فەزڵ وگەورەیی جیهاد و موجاهیدان کراوە:

**[إِنَّ اللَّهَ اشْتَرَى مِنَ الْمُؤْمِنِينَ أَنْفُسَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ بِأَنَّ لَهُمُ الْجَنَّةَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَيَقْتُلُونَ وَيُقْتَلُونَ وَعْدًا عَلَيْهِ حَقًّا فِي التَّوْرَاةِ وَالْإِنْجِيلِ وَالْقُرْآنِ**

**وَمَنْ أَوْفَى بِعَهْدِهِ مِنَ اللَّهِ فَاسْتَبْشِرُوا بِبَيْعِكُمُ الَّذِي بَايَعْتُمْ بِهِ وَذَلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ.**] سورة التوبة الآية 111

[بەڕاستی خوا، گیان و ماڵی لە ئیمانداران کڕیوە بەوەی کە بەهەشت بۆ ئەوانەو بەشیانە (بەڕاستی پەروەردگارێکی بەخشندەیە، هەر خۆی بەخشێنەری گیان و ماڵ و سامانە، کەچی ئاوا مامەڵە دەکات لەگەڵ ئیمانداراندا و نرخێکی نەبڕاوە، نرخێکی زۆر گەورەی بۆ بڕیارداوە، کاتێک لە پێناوی ئەودا دەیبەخشن) ئەوانە دەجەنگن لە پێناوی ئاینی خوادا، دوژمنانی ئاینی خوا دەکوژن (لە گۆڕەپانی جەنگدا(، یان دەکوژرێن و (شەهید دەکرێن)، ئەو پاداشت و بەڵێنە بەڕاستی لەسەر خوایە و باس کراوە لە تەورات و ئینجیل و قورئاندا، جا کێ هەیە بە قەدەر خوا بەوەفاو بەئەمەک بێت بۆ جێ بەجێکردنی بەڵێنەکانی، کەواتە زۆر دڵخۆش و کامەران بن بەو مامەڵەیەی کە ئەنجامتانداوە و بەو فرۆشتن و کڕینەی کە لەسەری ڕێککەوتوون، بێگومان هەر ئەوەشە سەرفرازی و سەرکەوتنی نەبڕاوە و بێ سنوور.]

[ **يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَى تِجَارَةٍ تُنْجِيكُمْ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ * تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَتُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِأَمْوَالِكُمْ وَأَنْفُسِكُمْ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ تَعْلَمُونَ * يَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَيُدْخِلْكُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ وَمَسَاكِنَ طَيِّبَةً فِي جَنَّاتِ عَدْنٍ ذَلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ * وَأُخْرَى تُحِبُّونَهَا نَصْرٌ مِنَ اللَّهِ وَفَتْحٌ قَرِيبٌ وَبَشِّرِ الْمُؤْمِنِينَ.**] سورة الصف الآيات 10-13

[ ( 10 )ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، دەستنیشانی بازرگانیەکتان بۆ بکەم، کە لە سزایەکی بە ئێش ڕزگارتان بکات .

( 11 ) سەرەتا باوەڕهێنانتانە بە خواو پێغەمبەرەکەی، ئینجا هەوڵ و تێکۆشانتانە لەڕێگەی خوادا بە بەخشینی ماڵ و سامانتان، وە بەخشینی خۆتان (واتە :ماندووکردنی جەستە و بیروهۆشتان، تا بەخت کردنیان لەپێناوی خوادا ( بێگومان ئەو کارەتان چاکترو بەفڕترە بۆتان ئەگەر بزانن و تێبگەن.

( 12 )ئەوسا خوا لە گوناهو هەڵەکانتان خۆش دەبێت و دەتانخاتە باخەکانی بەهەشتەوە لە چەندەها ڕوبار بەژێر درەختەکانیدا تێ دەپەڕێت و جاریە، هەروەها کۆشک و تەلاری خۆش و ڕازاوە و پاك و خاوێن لە باخەکانی بەهەشتی عەدندا، بەڕاستی ئا ئەوەیە سەرکەوتن و سەرفرازی و دەستکەوتی گەورە و بێسنوور.

( 13 )جا شتێکی تریش هەیە کە حەزی لێ دەکەن، ئەویش بەخشینی سەرکەوتنە لەلایەن خواوە و کردنەوەی وڵاتان و دڵەکانە، ئەو مژدەیەش بدە بە ئیمانداران (لە هەموو سەردەمێک، گەر ئیمانداران لێ ببڕێن بۆ ئاینی خوای مەزن)

**{ وَلا تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَمْوَاتاً بَلْ أَحْيَاءٌ عِنْدَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ }** [آل عمران:169]

[ ( 169 )هەرگیز وامەزانن و وادامەنێن ئەوانەی لەپێناوی خوادا شەهید بوون و کوژران، مردوون، نەخێر وانیە، بەڵکو ئەوانە زیندوون، لای پەروەردگاریان لە ڕزق و ڕۆزیی (هەمە جۆرو تایبەت) بەهرەوەرن.]

**[وَلَا تَقُولُوا لِمَن يُقْتَلُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَمْوَاتٌ ۚ بَلْ أَحْيَاءٌ وَلَٰكِن لَّا تَشْعُرُونَ]** (154) البقرة

[ ( 154 )جا هەرگیز بەو کەسانەی لە ڕێگەی خوادا دەکوژرێن و شەهید دەبن، مەڵێن: مردوون، نەخێر ئەوانە زیندوون و بەڵام ئێوە هەست بە زیندوویەتی ئەوان ناکەن.]

قال تعالى: {**قل هل تربصون بنا إلا إحدى الحسنيين ونحن نتربص بكم أن يصيبكم الله بعذاب من عنده أو بأيدينا فتربصوا إنا معكم متربصين**} [سورة التوبة:52].

( 52 ) بڵێ: ئایا ئێوە لە یەکێک لەو دوو سەرئەنجامە چاکە زیاتر چاوەڕوانی چیمان بۆ دەکەن، لەکاتێکدا هەردووکیان چاکن و ئاواتیان بۆ دەخوازین (کە: یان سەرکەوتنە، یان شەهید بوون) ئێمەش هەمیشە چاوەڕێی ئەوە دەکەین خوای گەورە بەڵاو سزایەکی تایبەتی خۆیتان بەسەردا ببارێنێت، یان بەدەستی ئێمە تووشی شکستی و نەهامەتی ببن، دە ئیتر ئێوە خۆتان مەڵاس بدەن و چاوەڕێ بن، بەڕاستی ئێمەش لەگەڵتاندا چاوەڕێین.

ابن كثير دەربارەی{أو بأيدينا} دەڵێت: واتە کوشتن و بەکۆیلەگرتنیان، تەبەریش دەڵێت: ئیە چاوەڕوانی لە خوا دەکەین ئەو کافرانە ئەشکەنجە بدات بە دەستی ئێمە بەر لە ئەشکەنجەی ئاخیرەت و سەربڕینیش لەناو ئەو ئەشکەنجانەدایە.!

**قال ابن كثير في قوله تعالى {أو بأيدينا}: (أي القتل أو السبي)، وكذا قال الطبري، فنحن ننتظر بهؤلاء الكفار أن يعذبهم الله بأيدينا قبل عذاب الآخرة والنحر يدخل في ذلك.**

# ئیسلام وەك ئاینێکی جەنگاوەر

# بەشی دووەم

## ڕوحی جەنگاوەری لە سونەتدا

ئەوە لە قورئاندا، لە سونەتدا دەهێندەی تر ستایش و بەرزڕاگرتنی جیهاد وموجاهیدان هەیە، هەر ئەو ئایەتانەی کە دەڵێن " وامەزانن و وادامەنێن ئەوانەی لەپێناوی خوادا شەهید بوون و کوژران، مردوون، نەخێر وانیە، بەڵکو ئەوانە زیندوون، لای پەروەردگاریان" دەیان حەدیسی لەسەر هاتوە کەوا ڕوحی

شەهیدان دەچێتە شێوەی باڵندەی سەوز ولە بەهەشتدا دەخولێنەوە و بە کەیفی خۆیان دەخۆن ودەخۆنەوە!

لە تەفسیری الطبری دەیان ڕیوایاتی هێناوە لەو بارەیەوە:

**حدثني المثنى قال، حدثنا محمد بن جعفر قال، حدثنا عثمان بن غياث. قال، سمعت عكرمة يقول في قوله " :ولا تقولوا لمن يُقتل في سبيل الله أمواتٌ بل أحياءٌ ولكن لا تشعرون " قال، أرواح الشهداء في طير خُضر في الجنة.**

**حدثني المثنى قال، حدثنا إسحاق قال، حدثنا ابن أبي جعفر, عن أبيه, عن الربيع في قوله " :ولا تقولوا لمن يُقتل في سبيل الله أمواتٌ بل أحياء" ، في صُوَر طير خضر يطيرون في الجنه حيث شاءوا منها، يأكلون من حيث شاءوا.**

لە حەدیسی تر هاتوە کە فەزڵی شەوێکی جیهاد لە پاسەوانیدا دەدا بەسەر فەزڵی شەوی قەدر کە لە هەزار مانگ عیبادەت خێری زیاترە.

لە حەدیسێکی تردا فەزڵی دەداتە سەر هەزار شەو کە بە شەوەکەی لە شەونوێژکردن دابیت و ڕۆژەکەی لە ڕۆژووگرتندا بیت.

**عن عبد الله بن عمر رضي الله عنهما أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: {ألا أنبئكم بليلة أفضل من ليلة القدر؟ حارس حرس في أرض خوف لعله أن يجرع إلى أهله}**

**عن عثمان رضي الله عنه قال: سمعت رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول: {حرس ليلة في سبيل الله أفضل من ألف ليلة يقام ليلها، ويصام نهارها}**

ئەنەس دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر [د.خ] دەڵێت: [هیج کەسێك بچێتە بەهەشت حەز ناکات بگەڕێتەوە دنیا هەرچیەکی هەبیت لە دنیادا جگە لە شەهید نەبێت، کە تەمەنا دەکات بگەڕێتەوە ودە جاریتر بکوژرێت لەبەر ئەو ڕێز وشکۆیەی کە دەیبێنێت.

**عن أنس رضي الله عنه أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: {ما أحد يدخل الجنة يحب أن يرجع إلى الدنيا، وإن له ما على الأرض من شيء إلا الشهد؛ فإنه يتمنى أن يرجع إلى الدنيا فيقتل عشر مرات لما يرى من الكرامة}**

لە هەمووی سەیرتر حەدیسێك دەڵێت لە ناسکترین کاتی عیبادەتی شەونوێژدا هاوەڵەکان نەفرەتیان لە کافران کردوە وگوتویانە: [ئەی خوایە بکوژی کافران کە خۆیان لادەدەن لە ڕێگای تۆ، وپێغەمبەرانت بەدرۆ دەخەنەوە، وباوەڕ بە بەڵێنەکانت ناکەن، جیاوازیان بخەرە نێوان ، وترس وبیمیان بخەرە دڵ، ئەشکەنجە ونەفرەتت بنێرە بۆیان، خوای هەق!!]

**(اللهم قاتل الكفرة الذين يصدون عن سبيلك ويكذّبون رسلك ولا يؤمنون بوعدك وخالف بين كلمتهم وألق في قلوبهم الرعب وألق عليهم رجزك وعذابك إله الحق)** [صحيح ابن خزيمة]. نازانم ئەو دوعایە جەنگاوەریانە چۆن میزاجی عیبادەتت تێك نادا داوای کوشتی کافرانی تێدا بکەیت؟!!

لە تەفسیردا کاتێك باسی ئایەتی ٣٣ سورەتی المائدة دەکرێت: {**إِنَّما جَزاءُ الَّذِينَ يُحارِبُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيَسْعَوْنَ فِي الْأَرْضِ فَساداً أَنْ يُقَتَّلُوا أَوْ يُصَلَّبُوا أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُمْ مِنْ خِلافٍ أَوْ يُنْفَوْا مِنَ الْأَرْضِ ذلِكَ لَهُمْ خِزْيٌ فِي الدُّنْيا وَلَهُمْ فِي الْآخِرَةِ عَذابٌ عَظِيمٌ**}

ئیبن کەسیر لە تەفسیرەکەیدا باسی تەفسیری ئەو ئایەتانە دەکات ودەڵێت:

**رواه البخاري ومسلم من حديث أبي قلابة - واسمه عبد الله بن زيد الجرمي البصري - عن أنس بن مالك : أن نفرا من عكل ثمانية ، قدموا على رسول الله صلى الله عليه وسلم فبايعوه على الإسلام ، فاستوخموا الأرض وسقمت أجسامهم ، فشكوا ذلك إلى رسول الله صلى الله عليه وسلم فقال: "ألا تخرجون مع راعينا في إبله فتصيبوا من أبوالها وألبانها؟ " فقالوا : بلى . فخرجوا ، فشربوا من أبوالها وألبانها ، فصحوا فقتلوا الراعي وطردوا الإبل . فبلغ ذلك رسول الله صلى الله عليه وسلم فبعث في آثارهم ، فأدركوا ، فجيء بهم ، فأمر بهم فقطعت أيديهم وأرجلهم ، وسمرت أعينهم ، ثم نبذوا في الشمس حتى ماتوا.**

[واتە کەسانێك لە هۆزی عوکل هاتنە لای پێگەمبەر [د.خ] بەیعەتیانپێیدا، دوایی تەندروستیان تێك چوو، سکاڵایان کرد لای پێغەمبەر، ئەویش فەرمووی: بۆ ناچن لەگەل شوانی وشترەکانمان تا سوود لە خواردنەوەی میز و شیریان ببینن؟ گووتیان: بەڵێ، دەرکەوتن میز و شیریان خواردەوە ، تەندروستیان باش بوو، دەمودەست شوانەکەیان کوشت، و وشترەکانیان ڕفاند، پێغەمبەر پێی زانین ونادری بەدوایاندا تا دەستگیر کران و هێنایانن، فەرمانی دا بە برینی دەست و پێیان لە بنەوە، وچاویانیش هەڵکۆڵن، ئینجا خرانە بەر خۆر تا مردن!!

لە ڕيوايەتێكى تردا انس دەڵێت: يەكێكيانم دەم لە زەوى دەدات لە تێنوێتيدا هەتا هەموويان مردن، دوايى ئەو ئايەتە هاتە خوارەوە: ) : إنما جزاء الذين يحاربون الله ورسوله...

**قال أنس : فلقد رأيت أحدهم يكدم الأرض بفيه عطشا حتى ماتوا ، ونزلت : إنما جزاء الذين يحاربون الله ورسوله ( الآية).**

من ناچيت بە عەقڵم كە ئەو ئايەتە لە باسى چەند كەسێكى هەرچى وپەرچى وبرسى هاتبێتە خوارە، چونكە موحارەبەى خوا و پێغەمبەر بە دزينى چەند وسترێك و كوشتنى شوانێك نايەتە دى! ناشڵێم ئەوانە تاوانيان نەكردبوو، بەڵام تۆڵەى وا بە قەسوەت، ئەگەر ڕاست بێت، گوومانى تێدا نيە كە توندوتيژى لاى ئەوانە دروست دەكات، كە ئەو تەفسيرە و ريوايەتانە دەخوێننەوە وباوەڕى پێ دەكەن، چونكە ئەوان بۆ وانەكەن ئەگەر قودوەى ئەوان كە پێغەمبەرە وايكردبێت.

## غەزوەى بەنى قورەيزە

كاتێك دێيتە سەر ژينامە و سونە چيرۆكى پڕ خوێناوى دەخوێنيتەوە وەك ڕوداوەكەى بني قريظة لە ساڵى پێنجەمى كۆچيدا، كە لە پاش گەمارۆدانيان ٢٥ ڕۆژ، خۆيان دايە دەست وپاش ئەوەى كۆمەڵێك لە هۆزى ئەوس چوونە لاى پێغەمبەر وگووتيان چۆن باش بوويت لەگەڵ بنى قينقاع كە هاوپەيمانى

خەزرەج بوون، ئاواش باش بە لەگەل بنی قریظەی هاوپەیمانی ئێمە. دوای ئەوە جولەکەکان ڕازی بوون بە داوەری سعد بن معاذ كە هاوپەیمان بوو لەگەلیان، کەچی سەعد چونکە زامدار ببوو لە گەمارۆکەی مەدینەدا، حوکمی کرد بە کوشتنی زیاتر لە ٧٠٠ پیاو و هەر مێردمنداڵێکی کە مووی بەری سەریان دەرکردبوو یانی منداڵی نێوان ١٢- ١٤ ساڵیش! هەروەها بە بە کۆیلەکردنی ژنان ومنداڵان و ماڵ و سامانیان.

بە نسبەت غەدرەکەی بەنی قورەیزە ڕاستە غەدرێکی زۆر گەورە و خیانەتێکی زۆر گەورەیان کرد لە پێغەمبەر و موسڵمانان، دەڵێم ئەوانەی بەرپرس بوون وکاربەدەست بوون موستەهەقی سزا بوون، ئەو سزایەش دەبێت لە ئومەتی [ولا تزروا وازرة وزر اخرى] بوەشابایەوە، نەك وەك سونە دەڵێت وەك سزای هۆلاکۆ و بەعس و ڕژێمی تورکیای عوسمانی و ئەتاتۆرکی، و هەر سەرلێ شێواوێکی تر، کە خەڵك بە کۆمەڵ سزا بدەن، و وەك لە هەموو کتێبەکانی حەدیس هاتووە هەتا منداڵی ١٢ -١٣ ساڵیش لە ملی بدرێت، ئەو ڕیوایەتەی کە باسی کوشتنی منداڵی توك لێهاتوو دەکات عطية القرظي سەحابی دەیگێڕێتەوە، کە یەکێکە لە زانایانی سەحابە، و خۆشی منداڵێك بوە لەو کاتەی بەنی قورەیزە سزا دراوە و دەڵێت:

**( وعن عطية قال : { عرضنا على النبي صلى الله عليه وسلم يوم قريظة ، فكان من أنبت قتل ، ومن لم ينبت خلي سبيله ، وكنت ممن لم ينبت فخلي سبيلي } رواه الخمسة وصححه الترمذي وفي لفظ : { فمن كان محتلما أو نبتت عانته قتل ، ومن لا ترك } رواه أحمد والنسائي )**

[ئیمە نیشاندارین بە پێغەمبەر [د.خ] ڕۆژی قورەیزە، ئەوەی موو لەبەری هاتبایە دەكوژرا، ئەوەشی مووی لێ نەهاتبوو بەردەدرا، منیش لەوانە بووم كە مووم لی نەهاتبوو، بۆیە ئازاد كرام لە مردن]

باوەڕ ناكەم كتێبێكی حەدیس و فقە و تفسیر هەبێت ئەو ریوایەتەی تێدا نەبێت، لای زانایانی حەدیس و تەفسیر و فقە هیچ كیشەیەك لەوەدا نییە، لەبەر جیاوازی سەردەم دیارە كە باسی دەكەن زۆر بە شێوەیەكی سارد و بی باكانە باسی دەكەن، وەك ڕوداوەكەی زینا كە مالیك دەیگێڕێتەوە، تەنها وەك كەرەستەیەكی فیقهی باسی دەكەن وبەس! دەڵێن ئەوە بەڵگەیە لەسەر ڕەوایەتی كوشتنی هەر كەسێك تەنها بەری تووكی لێهاتبێت.

هەتا گێڕانەوەی عطیة القرظي یش هەر وەك ڕوداوێكی ئاسایی دەیگێڕێتەوە كە حوكمێكی شەرعی لێ ئیستیفادە دەكرێت! هەرچەندە بەو گێڕانەوەی كارێكی زۆر گەورە وترسناكی كردوە.

ئەوەی زۆر سەیرە ئەو حوكمە ئەگەر ڕاست بێت، چونكە من هەردەم بە گومانەوە دەڕوانمە ڕیوایەتەكان، ئەوە زیاتر لە حوكمی تەورات و هۆز و عەشایرەكان دەچێت، نەك حوكمی خوا لە ژوور حەوت ئاسمانەوە وەك حەدیسێک بەو مانایە لە پێغەمبەر دەگێڕنەوە. [لقد حكمت فيهم بحكم الله من فوق سبعة ارقعة -أي سماوات].

كێشەكە ئەوە نییە ئەو ڕیوایەتە و ڕووداوە ڕاستە یان نا، باوەڕی پێدەكەین یان نا، بەڵكو كێشە ئەوەیە ئەو ریوایەتە هەردەم ئامادەیە لە هەموو كتێبەكانی حەدیس وتەفسیر و فقە ومێژوو، هەتا لەناو قورئانیش كاتێ ئایەتەكانی ٢٥ - ٢٦ الاحزاب تایبەت بەو ڕوداوە یش دەخوێنیتەوە: ﴿ **وَرَدَّ اللَّهُ الَّذِينَ كَفَرُوا**

بِغَيْظِهِمْ لَمْ يَنَالُوا خَيْراً وَكَفَى اللَّهُ الْمُؤْمِنِينَ الْقِتَالَ وَكَانَ اللَّهُ قَوِيّاً عَزِيزاً {25} وَأَنزَلَ الَّذِينَ ظَاهَرُوهُم مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ مِن صَيَاصِيهِمْ وَقَذَفَ فِي قُلُوبِهِمُ الرُّعْبَ فَرِيقاً تَقْتُلُونَ وَتَأْسِرُونَ فَرِيقاً {26} وَأَوْرَثَكُمْ أَرْضَهُمْ وَدِيَارَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ وَأَرْضاً لَّمْ تَطَؤُوهَا وَكَانَ اللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيراً﴾ {سورة الأحزاب} بتەوێ لە مانا وتەفسیری تێبگەیت، هەر تەفسیرێك بکەیتەوە ئەو شەڕە و ئەو وردەکاریەت پیدەڵێت، یانی ڕاست بێت یان ڕاست نەبێت، کاریگەری خۆی جێهێشتوە لەسەر فۆرمەڵەکردنی عەقڵیەتی موسڵمانی سەلەفی بە تایبەتی و موسڵمانەکانی تر بە گشتی! بۆیە کە داعشیەکان بە کۆمەڵ سەری خەڵك دەبرن، و لە ڕۆژێکدا ۱۷۰۰ لە سەربازگەی سپایکەر دەبەنە سەر چاڵ و ڕوبار سەریان دەبڕن بەو متمانە بەخۆبونەوە، ئەوە پێت دەڵێت بۆ بترسین ئەگەر سەلەفیش وایان کردبێت! هەتا یەکێکیان لەبارەی سوتاندنی ئادەمیزاد وتارێکی نوسیوە لە سایتەکانی داعش بە ناوی [ولكم في الحرق سلف!] کە هەندێکی لەو وتارەدا باس کراوە.

## ڕوحی جەنگاوەری لە لای زانایانی ئومەت

بێگومان زانایان و ئیمامەکان و موفەسیر وفەقیهەکان و موحەدیسەکان بەو ڕووحە جەنگاوەریەی ئیسلام بەسیان نەکردوە، بەڵکو دەهێندە کەلەپووری پڕ لە قینەی لۆکاڵی عەرەبی خۆیان خستۆتە سەر وتێکەڵیان کردوە بە تەفسیر و بە فیقه و بە هەڵبەستنی حەدیس و بە شیعر وئەدەبیات هۆنینەوە.

بۆ نمونە وەرە ببینە لە قورئاندا ئایەتیك نیە باسی بەردبارانکردنی زیناکار بکات، کەچی زانایانی عەرەب هاتوون بە هەزار شێوە چەندین ڕیوایاتیان

دروستکردوە تا  بەزۆر ئەو حوکمەی بەردبارانکردنە بکەنە حوکمێکی قورئانی بە ناوی ئایەتێك کە دەنگی هەیە ورەسمی نییە لەناو قورئاندا! یانی هەتا گریمان رەجم وەك دەیەها حەدیس دەڵێت، لەسەر دەستی پێغەمبەر [د.خ] کراوە، بەڵام کاتێ قورئان کۆکراوەتەوە دیارە ئەو ئایەتە بە تەواوی نەسخ کراوە و لابراوە، لە جیاتی زانایانی ئیسلام بە هەڵی بزانن بۆ لادانی ئەو حوکمە پڕ قەسوەت و زبرە [بە گوزارشی السیوطي] کەچی هاتوون وشەڕی مان ونەمان دەکەن بۆ سەلماندنی.

مالک بن انس لە کتێبە ناودارەکەی الموطأ کە بە یەکەمین کتێبی مەنهەجی ڕێك وپیك نوسراوی حەدیس دادەنرێت، هەتا شافیعی بەر لە دەرکەوتنی سەحیحی بوخاری دەیگووت: ما کتاب بعد کتاب الله أنفع من کتاب مالك بن أنس! هیچ کتێبێك لە الموطأ مالك بن انس لە دوای کتێبی خودا بەسودتر نییە! حەدیسی ئایەتی رەجمی گواستۆتەوە و دەڵێت:

**مالك ، عن يحيى بن سعيد ، عن سعيد بن المسيب أنه سمعه يقول : .....لما صدر عمر بن الخطاب من منى أناخ بالأبطح ... ثم قدم المدينة ، فخطب الناس ، فقال : ....إياكم أن تهلكوا ، عن آية الرجم أن يقول قائل : لا نجد حدين في كتاب الله ، فقد رجم رسول الله - صلى الله عليه وسلم  -وقد رجمنا ، والذي نفسي بيده لولا أن يقول الناس : زاد عمر بن الخطاب في كتاب الله لكتبتها الشيخ والشيخة فارجموهما ألبتة فإنا قد قرأناها.**

[ئاگادار بە هیلاك نەچن لە ئایەتی ڕەجمدا، کەسێك نەڵێت: ناکرێت دوو سزا هەبێت لە کتێبی خوادا [بۆ یەك تاوان]، چونکە پێغەمبەر ڕەجمی کرد و ئێمەش لەگەڵیدا ڕەجممان کرد، قەسەم بەوەی ژیانی منی بە دەستە ئەگەر لەبەر گۆتە

گۆتی خەڵك نەبێت بڵێن: عومەر شتی زیاد کردوە بۆ کیتابی خوا دەمنوسی: پیرەمێرد وپیرە ژن بەردبارانیان کەن تامردن، ئێمە دەمانخوێندەوە!]

ئەو ڕیوایەتە کێشەی زۆر زۆرە لە وتارێکی تر باسم کردوە، بەڵام ئەو ئایەتە کێشەی زۆر بۆ قورئان دروست دەکات، ئەگەر لە قورئاندا بووە چی پیویستی دەکرد عومەر بە بیری خەڵکی بهینیتەوە، بە تایبەتی ئەو کاتە قورئان جەمع نەکرابووەوە؟! ئەگەر ڕەجم لە ئایەتیکی ڕاشکاوی وەك پیرەمێرد وپیرەژنی داماو باسی کرابێت، بۆ دەبێت خەڵك لە بیری چوو بێت وپێویست بە عومەر بکات بیریان خاتەوە؟! ئەگەر ڕاستە عومەر وا بە پەرۆشیەوە ئەو ئایەتەی بیری خەڵک هینابێتەوە، بۆ پاش ماوەیەکی کەم لە هاتنی حەزرەتی عوسمان، ئەوانەی قورئانیان کۆکردەوە ئەو ئایەتەیان لەبیر چوەوە؟ ئەی ئەوە کێشە بۆ [انا نحن نزلنا الذکر وانا لە لحافظون] دروست ناکات.

ئەهلی حەدیس وەک پیشەی هەمیشەییان لە عوزرهێنانەوە بۆ هەموو ناماقوڵیەکان، زوو بە هانای ئەو دەرەنجامە ترسناکەی ئەو ئایەتەی رەجم هاتنەوە وگووتیان [لەفزی نەسخ کراوە و حوکمی ماوە] السیوطي قسەیەکی سەیر دەکات لە [الاتقان في علوم القرآن] دەربارەی هۆی لابردنی خوێندنەوەی ئایەتەکە لە قورئان و دەڵێت: من بیرۆکەیەکی باشم بۆ هات، ئەویش ئەوەیە لابردنی ئەو ئایەتە لە قورئان بۆ سوك کردنەوەی ئەو سزایەیە لەسەر ئومەت بە نەخوێندنەوەی و نووسینی لە قورئاندا، هەرچەندە حوکمیشی مابێت، چونکە قورسترین حوکم وتووندترینیان و زبرترین سزایە، وئەوەش ئاماژەیە بۆ چاکی سەترکردن وداپۆشینی [شتی زبر و قورس].

" قلت وخطر لي في ذلك نكتة حسنة وهو أن سببه التخفيف على الأمة بعدم اشتهار تلاوتها وكتابتها في المصحف وإن كان حكمها باقيا لأنه أثقل الأحكام وأشدها وأغلظ الحدود وفيه الإشارة إلى ندب الستر".

ئەوەی مایەی پێكەنینە بەو قسەیەی السیوطي ئەوەیە ئەگەر ئایەتی ڕەجم هێندە بە ئازاربێت بۆ تەنها خوێندنەوە و گوێ لێبوون وخوا بەزەیی بە ئادەمیزادەوە هاتبێت و نەسخی كردبێت تا گوێ وچاوی ئەزیەت نەدات، ئەی كاتێك لەسەر ئەرز بە كردار ئەو ڕەجمە دەكرێت دەبێت چەند قاتی تر بە ئازار بێت، و بۆ هیچ بەزەییەك نە جوڵا؟! ئەوە قەسوەتی جەنگاوەرانە كە هیچ بیانوێك بۆ ڕزگاركردنی ئادەمیزاد نادۆزێتەوە لەو چارەنوسە پڕ قەسوەتە.

لە ڕیوایەتێكی تری مالك ئەو قەسوەتە زۆر ئاشكرا دەردەكەوێت كاتێ حەدیسێكی ڕەجم باس دەكات:

**حدثنا مالك عن نافع عن عبد الله بن عمر أنه قال جاءت اليهود إلى رسول الله صلى الله عليه وسلم فذكروا له أن رجلا منهم وامرأة زنيا....... فأمر بهما رسول الله صلى الله عليه وسلم فرجما فقال عبد الله بن عمر فرأيت الرجل يحني على المرأة يقيها الحجارة قال مالك يعني يحني يكب عليها حتى تقع الحجارة عليه.**

[كاتێ ژن وپیاوێكی جولەكە بڕیاری بەردبارانكردنیان دەدرێت، وعەبدوڵای كوڕی عومەر دەڵێت: دیم پیاوەكە خۆی چەماندۆتەوە سەر ژنەكە بۆ ئەوەی لە بەردەكان بیپارێزێت! مالیك دەڵێت چەماوەتەوە سەری یانی دەیپارێزێت لەبەرد تا پێی نەكەوێت، هەی ئافەرین بۆ ڕوونكردنەوەت.

لە كتێبی المدونة الكبرى لمالك بن أنس، كِتَابُ الرَّجْمِ ئەو گفتوگۆیە هاتوە لە لایەن نوسەری مودەوەنەكە :

گووتم: ئەوەی ڕەجم دەكرێت چاڵی بۆ لیدەدرێت لای مالك؟ گووتی: مالك پرسیاری ئەوەی لێكرا

وگووتی: گوێم لێنەبوە لە هێچ كەسێك كە سزایەكی جێبەجێ كردبێت، كە چاڵ لێبدات، من پێموایە چاڵی بۆ لێنادرێت.

مالیك دەڵێت: ئەوەی بەڵگەشە لەسەر ئەوە، ئەو حەدیسەیە كە دەڵێت: دیم پیاوەكە خۆی چەماندۆتەوە سەر ژنەكە بۆ ئەوەی لە بەردەكان بیپارێزێت!ئەگەر لە چاڵ بان نەیدەتوان بجەمێتەوە بۆسەر ئافرەتەكە.

**قُلْتُ : هَلْ يُحْفَرُ لِلْمَرْجُومِ فِي قَوْلِ مَالِكٍ ؟ قَالَ : سُئِلَ مَالِكٌ عَنْهُ.**
**فَقَالَ :مَا سَمِعْتُ عَنْ أَحَدٍ مِمَّنْ مَضَى يَحُدُّ فِيهِ حَدًّا أَنَّهُ ، حُفِرَ لَهُ أَوْ لَمْ يُحْفَرْ ، إلَّا أَنَّ الَّذِي أَرَى أَنَّهُ لَا يُحْفَرُ لَهُ.**
**قَالَ مَالِكٌ : وَمِمَّا يَدُلُّ عَلَى ذَلِكَ الْحَدِيثُ.**
**قَالَ " :فَرَأَيْتُ الرَّجُلَ يَحْنِي عَلَى الْمَرْأَةِ يَقِيهَا الْحِجَارَةَ " , فَلَوْ كَانَ فِي حُفْرَةٍ مَا حَنَى عَلَيْهَا وَلَا أَطْلَقَ ذَلِكَ.**

یانی مالك ئەو دیمەنە تراژیدیەی پڕ لە خۆشەویستیە سەرنجی ڕاناكێشێت، بەڵكو كیشەی تەنها حوكمێكی فیقهیە كە ئایە ئەوانەی ڕەجم دەكرێن قۆرت وچاڵیان بۆ لێدەدرێت یان نا!

ئەوە چ جۆرە قەسوەتێكە، كە تراژیدیایەكی وا سەرنجت ڕانەكێشێت؟! ئینجا دەڵێن ئەو وەحشە بەشەریانەی داعش لە كوێوە هاتوون! هەر ئەو

قەسوەتەیە پەڕیوەتەوە بۆ هەموو کایەکانی تری زانستە ئیسلامیەکان لە فیقە و تەفسیر وحەدیس و هتد، لە وێوەش بۆ توندڕەوان و داعشیەکان.

لە ئیسلامدا مەدرەسەی ئەهلی حەدیس، لەبەر توندوتیژی ڕوئیا و بیروبۆچونی، هەردەم لایەنگری توندتر کردنی توندەکان بووە، بۆیە دەستکاری کردنە ماناکانی قورئان لە ڕێگای بەستنەوەی بە روایات وتەفسیری تایبەت کە خزمەت بە تەعالیمەکانی ئەو مدرسەیە بکات، بە ئەئویل و روایات و نەسخ کردنەوە، وەك ئایەتی السیف، کە بەپێی تێگەیشتنی ئەو قوتابخانەیە ئەو یەك دوو ئایەتە هەموو ئایەتەکانی ئاشتی ودەستدرێژی نەکردن و ئازادی بیروباوەڕی وپیکەوژیانی نەسخکردوە، کە ژمارەیان لە ١٢٤ ئایەت زیاترە، کە ئەوەش خۆی لەخۆیدا پاڵنان بوو بە ئیسلام بۆ بەرەی توندوتیژی وەک ابن القیم دەڵێت: ((.... **فأقام . أي الرسول صلى الله عليه وسلم . بضع عشرة سنة بعد نبوته ينذر بالدعوة بغير قتال ولا جزية ويؤمر بالكف والصبر والصفح .ثم أذن له بالهجرة, وأذن له بالقتال, ثم أمره أن يقاتل من قاتله, ويكفّ عمّن اعتزله ولم يقاتله, ثم أمره بقتال المشركين حتى يكون الدين كله لله....))** انتهى. [زاد المعاد ج3 ص159] [پێغەمبەر [د.خ] زیاتر لە دەساڵ داوەتی بۆ دینەکەی دەکرد بەبێ شەڕ و جزیە ، وفەرمانی پێدەکرا بە دەس نەکردنەوە و ئارامگرتن و لێبوردەیی ، ئینجا مۆڵەتی پیدرا بۆ کۆچ کردن، ئینجا ڕێگای پیدرا بۆ جەنگ، ئینجا فەرمانی پێکرا بە جەنگ گیڕان دژی ئەوی جەنگی لە دژیدا بەرپاکرد، و دەستیشی درێژ نەکات بۆ ئەوانەی شەڕیان دەرهەق ناکەن، دوایی فەرماانی پێکرد بە شەڕکردن لە دژی موشریکان [بە رەهایی] تا دین هەمووی بۆ خوا دەبێت] یانی ئیسلام دەبێت لە شەڕێکی بێ پسانەوەدا بێت لەبەر ئەوەی کارمان

بە ئاشتی و ئازادی و هەموو مانا جوانەکان نەماوە کە هەموویان کردە قوربانی ئایەتەکانی شمشێر!

## ئیسلام وەك ئاینێکی جەنگاوەر

# بەشی سێیەم

## کاریگەری ڕوحی جەنگاوەری ئیسلام بەسەر داعشیەکان و موسڵماندا بەگشتی

لە سایەی ئەو هەموو کەلەپورەی وتاری جەنگاوەری ستایشی جیهاد و موجاهیدان لە هەموو دەقەکانی ئیسلامدا بە قورئان وحەدیس و قسەی زانایان و فەقیهان وموحەدیسانی ئیسلامدا، ئەو هەموو تەفسیر و حەدیسە پڕ لە ڕوحی جەنگاوەریە، ئەگەر ئیسلام مەبەستیشی نەبوبێت ئەو وتارە بەهێزە وەك هێزێکی توندوتیژی کاولکەر بەکار بهێنێت، بەڵام هەر دیندارێك کە دەکەوێتە ژێر کاریگەری ئەو خیتابە جەنگاوەریە، جۆرە پاڵنەرێکی زۆر تووندی بۆ جیهادکردن و خوبەخشکردن و حەزی مەرگ و هەموو کارێکی تووند وتیژی خوێناوی لا دروست دەبێت، ولای هەموو ئەوانەی بێ ئەزموونن و توانای سەبری عیبادەت وخواپەرستی ساڵەهایان نییە، بۆیە دەگەڕێن بە دوای کورترین ڕێگا بۆ گەیشتن بە بەهەشت و حۆری و نازو نیعمەتەکانی.

کارەساتەکە لە وەدایە زۆر لە گەنجانی حەماسەتدراو بەو وتارە و بە تایبەتیش ئەو گەنجانەی ژیانیان بە بەرەڵایی لە پابەندبوون بە هیچ بەهایەکی دینی وئەخلاقی بەسەر بردوە هەر کە کەوتنە ژێر کاریگەری ئایینی وگەڕانەوە بۆ باوەشی دین، تا دوێنێ ئەوەی کاری شەلاتی ودزی وداوێن پیسی و دەستدرێژی دەکرد، پاش دوو ڕۆژ لە تۆبە کردن و گەڕانەوە بۆ دین، لەجیاتی ڕوو لە لایەنە مرۆیی وخێرخوازەکەی دین بکات، وبڵێت من ساڵەهایە وەك شەلاتیەك خەڵک ئەزیەت دەدەم و دەستدرێژیان بۆ سەر دەکەم، کەچی ئامادەیە بە ناوی تۆبەکاری و جیهاد هەزار سەر سەربڕێت ، و خۆی بتەقێنێتەوە، و بکوژێ وببڕێ وهەموو کارێك بکات، تا بەڵکو بە کلیکێك [دوگمەی بۆمبی ئینتیحاری] دەچێتە

بەهەشتەوە. ئەو شەلاتيانە لەبەر ڕووحی پڕ شەڕ و ڕاهاتن بە توندوتيژی، و گوێ نەدان بە مەرگ وهەوڵی شەهادەت، زۆرجار گەيشتونەتە لوتكەی ئەو جەماعەتە داعشيانە، ونموونە زۆرن وەك زەرقاوی كە سەركردەی قاعيدە بوو لە عێراق، وعەنتەر زەوابری جەزائير ودەيەها شەلاتيتری ڕيزی دووەم وسێيەم، كە زۆريان هێشتا بە باشی فێری نوێژيش نەبوون كەچی چەقۆيان تيژكردوە بۆ سەربڕينی موسڵمانان وخەڵكيتر.

## لە كۆی ئەو باسەدا دەگەينە ئەو دەرەنجامانە:

١- رۆحی جەنگاوەری لە دەقەكانی ئيسلامدا هەتا لە قورئانيشدا زۆر بە هێزە، لە ئيستقراكردنی ئايەتەكانی قورئاندا دەردەكەوێت، كە ئەو ئايەانەی جيهاد زياتر پەيوەستن بە ڕوداوگەلێكی مێژوويی، و هاندانە بۆ پاراستنی ئيسلام لە قۆناغی دامەزراندندا، ولەوە و بەدواوە، باش نيە ئەو ڕوحيەتە گشتگير بكرێت، و دەبێت سنوردار بكرێت بەو هەلومەرجە مێژووييانەی كە ئەو دەقانەی تێدا هاتۆتە كايەوە، و دەكرێت ئەو ڕوحيەتە سوودی لی وەرگيرابێت لە ڕابردوو بۆ بەهێزكردنی گيانی جيهاد و بەرەنگاری بۆ پاراستنی ئيسلام لە سەرەتای قۆناغی دامەزراندنەوە، ويسترابێت بە شێوازێكی لۆژيكی لە شوێنی خۆيدا بەكاريان بهێنێت، بەڵام كێشەكە لە وەدايە زانايانی ئيسلام بە تايبەتی لە قوتابخانەی ئەهلی حەديس و سەلەفيەتی مێژوويی، ئەو روحيەتە جەنگاوەريەيان بە بەردەوامی وەبەرهێناوە و بەرهەميان هێناوەتەوە بۆ دروستكردنی فەزايەكی ترسناك و كاولكەر و پڕ لە نيگەرانی و بێ هەدايی! ، بۆيە كەس ناتوانێت كاريگەری نەرێنی ئەو ڕوحيەتە جەنگاوەرەيە بەسەر كۆی حاڵەتی دينداری فيكری و فەرهەنگی وكۆمەڵايەتی وسياسی و مێژووی نيمچە كۆن وئێستای ئومەتی ئيسلامی نكوڵی لێبكات. ئەو ڕوحيەتە جەنگاوەرە لە هەر كوێ بەرپا

کراوە، سەرەنجام خوێن ڕشتنی بێ سنوور وکاوڵکاری و ماڵوێرانی و تاوانی نامرۆیی واق وڕهێنەری لێکەوتۆتەوە. ئەفغانستان و عێراق و سوریا و سۆماڵ وهەر شوێنێکی تری دەستی ئەو ڕوحیەتە جەنگاوەرەی گەیشتوتێ بەو دەرەنجامە گەیشتوە. چونکە کوشتار وکوشتن کە تێکەڵ بە عەقیدە و ڕوحیەتی دینداری بوو، زۆرجار لەبەر نەشوەی ئەجری گەورەی شەهادەت وجیهاد و بە هەشت و نازونیعمەتەکانی وحۆریە لە حەدبەدەر جوانەکانی، کە ئەگەر یەکێکیان ڕووی دەرکەوت لە دونیا، هەموو جیهان ڕوناك دەکاتەوە، وەك لە بوخاریدا هاتوە، و بۆنی مسک و خۆشیەکەی دنیا پڕدەکات، و چارشێوەکەی سەری چاکترە لە دنیا و ئەوەی تێشیدایە: **ولو أن امرأة من نساء أهل الجنة اطلعت إلى الأرض لأضاءت ما بينهما ولملأت ما بينهما ريحا ولنصيفها يعني الخمار خير من الدنيا وما فيها** . و لە ڕیوایەتێکیدا لە ابن عباسەوە دەگێڕنەوە: **ولو أخرجت نصيفها لكانت الشمس عند حسنها مثل الفتيلة من الشمس لا ضوء لها ولو أطلعت وجهها لأضاء حسنها ما بين السماء والأرض ولو أخرجت كفها لافتتن الخلائق بحسنها** .

دەڵێت خۆر لە چاو جوانی چارشیوەکەیدا وەك چرایەکی بێ ڕوناکی وایە! ئەگەر دەموچاوی دەرکەوت هەموو نێوانی ئەرز و ئاسمان ڕوناك دەکاتەوە، ئەگەر ناو لەپێکی دەرکەوت، تێکڕای بەنی ئادەم شێت وشەیدای دەبن! ئینجا وەرە خۆت مەتەقێنەوە، و خۆت بە دار وبەرد دامەدە، کە ئەو قسانەت گوێ لێ بێت بەناوی پێغەمبەرەوە.

٢- زانایانی ئیسلام لە ژێر کاریگەری ئەو ڕوحیەتە جەنگاوەریە، جگە لە بەشێکی کەم لە ئەهلی تەسەوف و عیرفان و دڵ و عیبادەت نەبێت، زۆربەیان هەتا یەکێکی وەك البوطی یش، وەک پێشەوایەکی جەنگاوەر و سەربازی رەفتاریان

کردوه و ئێستاش هەروا دەکەن، وتا توندتر هەبێت، لاناکەنەوه بەلای نەرمترا هێندە عەسکەریانه وبێ بەزەییانه حوکم وفەتوا دەدەن دەڵێی دەرچووی ئەکادیمیه عەسکەریەکانن، وباسی دین بۆ خەڵك دەکەن وەك ئەوامر و دیسپلینی عەسکەری، وات کرد، کافر دەبیت، وات گووت، کافر دەبیت، دوایی دەکوژرێیت! ئەگەر نیەتی نوێژت بە دەنگ هێنا و سوور بوویت لەسەری کافر دەبیت و دەکوژرێیت! زۆرجار هێندە عەسکەریانه رەفتار دەکەن پیاو دەڵێت: دەبیت ئەوانه هەر تووشی سادیزمیەت و حەزی ئەزیەتدانی خەڵك نەبووبن؟! بۆ نمونه لەژێر [باب شدة مالك في اقامة حدود الله تعالی]! هاتوه: پیاوێك براکەی خۆی کوشتبوو، چوونه لای حەزرەتی مالیك بن انس داوەریان بۆ بکات، دایك وباوکی بکوژ وکوژراوەکە لە کوڕە بکوژەکەیان خۆش بوون، تا هەردوو کورەکانیان نەکوژرێت! کەچی سەرەڕای دەیان دەق کە هەق بە خاوەن خوێن [ولی الدم] دەدات کە خۆش بێت یان نا، مالیك سوور بوو لەسەر لە ملدانی کوڕەکەی تریان! دایک وباوکەکە گووتیان: دوێنێ کوڕێکمان بکوژرێت، و ئەمڕۆ یەکیکی تریش؟! ئێمە خاوەن خوێنین و خۆش بووین! والی گووتی: ئەبو عەبدوڵلا کەسیتر خاوەن خوێن نیە داوای سزا بکات و ئەوانیش خۆشبوون. کەچی مالیک زیاتر بە ڕق داچوو و گووتی: وەڵلاهی کە خودایتر جگە لە خۆی نییە، یان تا عومرم ماوە باسی عیلم و زانست ناکەم، یانیش دەبێت لە ملی بدرێت!! لەپاش ئەو قسەیە بێ دەنگ بوو و وەڵامی نەدەدایەوە کە پرسیاریان لێدەکرد! مەدینە کەوتە ژاوەژاو و خەڵك هاواری لێ هەستا بوو: ئەگەر مالیك بێ دەنگ بێت پرسیار لە کێ بکەین [نازانم گواستنەوی راستەوخۆ هەبوو یان چۆنیان زانی خەڵکی مەدینە لە خەمی مالك هاواریان لێ هەستاوە؟! وەی لەو کارەساتەی قوڕمان بەسەر] ؟! گووتیان: کەس وەک ئەو نیە، وشوێنی ئەو ناگرێتەوە لە عیلم و فەزڵ.

والیش وەک هەر سیاسیەکی هەلپەرست ناوێرێت قسەی ئیمامێکی گەورە رەتکاتەوە، نەوەك دلی برەنجێ و فەرمانی کرد و لەسەری کوری دووەمیان دا وکوشتیان! لە کۆتایی ڕیوایەتەکە دەڵێت" کاتێ سەری بکوژەکە کەوتە خوارەوە، مالیك ڕووی لە ئامادەبووان کرد وگووتی: من کوشتمەوە بە حەدی الحرابة [واتە دزی وڕێگری وتاڵانی] چونکە جلی براکەی دزی بوو، من لەبەر سزای کوشتنی برای بریاری کوشتنم نەدا، چونکە دایک وباوکی لێی خۆش بوون!! یانی کەزانی ڕێگای کوشتنی لێگیراوە لەبەر لێبوردنی دایك وباوکی، بەدوای بیانوێکیتر گەڕاوە تا الحرابة دۆزیەوە، کە هیچ مەرجێکی حیرابەی بەسەر جێبەجێ نابێت، لە جیاتی ڕوحی ئەو کوژراوە نەیکوشتوە، بەڵکو لەبەر جلێکی چەند درهەم نرخ!!! لە هەمووی خۆشتر لەبەردەم ئەو تراژیدیایە کە دایک وباوکێك دوێنێ منداڵێکیان کوژراوە و ئەمڕۆش یەکیکیتر بەبەرچاویان لەملی دەدرێت، خەڵکە ئامادەبووەکە هێندە نیگەران نەبوون بە نیگەرانیان بۆ مانگرتنی مالیك لە قسە! و لە کۆتایی هاتووە" خەڵکەکە ئەوێیان جێ هێشت و بە خاترجەمیی ودڵخۆشیەوە چونکە سوێندەکەی مالیك بەر عەرز نەکەوت، لەبەر ئەوەی خەڵکەکە دەیانزانی سوێند ناشکێنێت!!!" هەتا قازی عەیازی یش کە زاهید و عابدێکی گەورە بووە کە ئەو بابەتە دەگێڕێتەوە میشێکیش میوانی نەبووە! ئەوەش کاریگەری دەروونی جەنگاوەریە.

**لە کتێبی ترتیب المدارك وتقريب المسالك لمعرفة أعلام مذهب مالك، القاضي عياض بن موسى بن عياض السبتي، چاپی ٢ ساڵی ١٩٨٣، مەغریب، دار مكتبة الحياة، جوزئی دووەم، ل٥٨ وەرگیراوە.**

٣- عەوامی یان خەڵکی ئاسایی موسڵمانیش لەبەر کاریگەریە نەرێنیەکانی ئەو وتارە توندو خوێناویە میزاجی دەروونیان لەسەر ئەو بنەمایە توند وتیژە بنیات

نراوە، وەك لە ڕوداوەکەی مالیکی سەرەوە بینیمان " خەڵکەکە ئەوێیان جێ هێشت و بە خاترجەمیی ودڵخۆشیەوە چونکە سوێندەکەی مالیك لە بەر عەرز نەکەووت، لەبەر ئەوەی خەڵکەکە دەیانزانی سوێند ناشکێنێت".

ئەوەی ئەوەش دەسەلمێنێت سەرنج بدە هەمیشە خەڵکێکی زۆر سەرسامی دەردەبڕن بەو زانا و وتار بێژە دینیانەی کە زۆر توند وتیژن، لە بیرمە سەدان کەس بۆ نوێژی هەینی مزگەوتی تەك ماڵی خۆی جێ دەهیشت تا نوێژ لە مزگەوتێکی دوور بکات، چونکە مەلاکەی زۆر توند بوو، وڕاست وچۆپ جوێنی دەدا وهەڕەشەی دەکرد و خەڵکی هاندەدا! هەتا لەناو خەڵکی گشتی تا هەزارانیان بە بانگخوازێکی سەلەفی توندوتیژ و عەبوس وگرژ سەرسام دەبن، سەدا دەی ئەو ژمارەیە بە بانگخوازێکی میانڕەو و نەرم ونیان سەرسام نابن!! هەرچەندە حاڵەتەکە لەناو کورد باشترە لە کۆمەڵگا ئیسلامی وعەرەبیەکانی تر. من گومانم نیە، ئەمڕۆ داعش لەسەرتاسەری ئەو جیهانە ئیسلامیەدا بەری ئەو وتارە ستایشکارەی جیهاد و موجاهیدان دەچنێتەوە، کە شەڕ وجیهاد و پایەی موجاهیدانی خستۆتە سەرتۆپی پایەکان، وهیچی وای بۆ بواری نەرم ونیانی ومرۆڤدۆستی نەهێشتۆتەوە. هەر ئەوەش وای کردوە بە توندی دژایەتی هەر کەسیک بکرێت کە لەگەل نەرم ونیانی و خۆشەویستی بێت یان هەوڵی سوککردنی روحی دینداری کردبێت لەسەر خەڵك. دەبێت هەوڵ نەدرێت منداڵان لە قوتابخانە و خەلکیش لە مزگەوت و بەرنامە ئاینیەکان ئاڕاستە بکرێن بەرەو بایەخێکی بێ سنوور بە حەدیس و ئایەتەکانی جیهاد و پایەی موجاهیدان، لەجیاتی ئەوە ڕووحی دینداری خێرخوازیان تیادا بچێنرێت، من لە بیرمە کە تازە دەستم بە دینداری کردبوو، هێشتا هیچێکی وام نەدەزانی کاتێ کتێبەکەی عبدالخالق معروف، [مرۆڤ لە کۆمەڵی کوردەواریدا] دەرچوو، کە

خوێندمەوە، لەگەڵ چەند برادەرێك گفتوگۆمان لەبارەیەوە دەکرد، بەمن با بە دەستی خۆم سەری نووسەرەکەی هەڵکێشم، هێشتا کتێبێکی سەلەفیشم نەخوێندبووەوە!! چونکە ئەگەر گیراشم و کوژرامەوەش ئەوە شەهیدم.

٤- لە خۆڕایی نییە زانایانی ئەهلی تەسەوف و ئیمامی غەزالی [ابو حامدی غەزالی] بە نمونە وەک زانایەک، مەوسوعەیەکی وا گەورە و گران بە ناوی ژیاندنەوەی زانستی دین ، [احیاء علوم الدین] دەنووسێت کەچی باسی هەموو لایەنێکی دین و ژیاندنەوەی چەمکە دینیەکانی کردوە، بەڵام هەر بەلای باسی جیهاد وموجاهیدین و پلە و پایەیان دا نەچووە، لە کاتێکدا غەزالی لە سەردەمی شەڕی خاچ پەرستان ژیاوە!کە لە ساڵی ٤٩٢ هـ قودسیان داگیرکردوە، و غەزالی لە ساڵی ٥٠٥ کۆچی وەفاتی کردوە! سەلەفیەت هەستی بەو هەڵوێستەی سۆفیەت کردوە لە جیهاد وئایاتەکانی، بۆیە بە سەدان تۆمەت تۆمەتباریان دەکەن:دەڵێن سەرەڕای ئەو ڕوداوە گەورەیە و ئەو قوربانیانەی کە لێیکەوتەوە غەزالی بە وشەیەکیش بەسەری نەکردوە! زەکی مبارك دەڵێت:|"لە کاتێکدا پوترسی ناودار شەو و ڕۆژ خەریکی وتاردان و نامەناردن بوو، بۆ هاندانی خەڵکی ئەوروپا بۆ داگیرکردنی وڵاتانی ئیسلام، لەو کاتەدا غەزالی نوقمی ناو خەلوەتەکەی ببوو، سەرقاڵی دوعا وورده بیدعەییەکانی بوو، و نازانێت داعوە و جیهاد چی لەسەر واجیب کردوە؟!" دەڵێن ڕێچکەکانی سۆفیەت ڕوحی خاوبوون و تەمەڵی و تەواکول لە نێو موسڵمانان بڵاودەکاتەوە، و لە ابن صاعد دەگێڕنەوە کە شافیعی دەڵێت: بنچینەی تەسەوف تەمەڵییە.

من هەست دەکەم زانایای ئەهلی تەسەوف لە کۆنەوە توانیتیان پەی بەو ڕوحیەتە جەنگاوەریە بەرن، و بە ناڕاستەوخۆ هەوڵی فەرامۆشکردن و سوک کردنەوەی ئەو ڕوحیەتە جەنگاوەریەیان داوە لە ئیسلامدا، نەك لەبەر تەمەڵی،

و خاوخلیچی، بەڵکو بە مەبەست هەڵوەستەیان نەکردوە لەسەر بابەتە جیهادیەکان و مەوعیزە پێنەدانی و دنەنەدانی خەڵك بەو ئاڕاستەیە، و بە گۆڕینی چەمکی جیهادی خوێن وماڵ بۆ جیهادی نەفس و بەرزبوونەوەی نەفس وڕەوشتی مرۆڤ بۆ لوتکەی مرۆڤایەتی، وەك لای ابن عربی و مەولانا ڕۆمی و شێخانیتر، کە جیهانبینیان هێندە فراوان ببوو هیچ جیاوازیەکیان لە نێوان موسڵمان و نا موسڵمان نەدەبینی و بە گوزارشی ابن عربی خۆشەویستی کەون و کائینات ببوە دین وئیمانیان، تا ڕادەیەك مەسیحی و جولەکەش متمانەیان پێیان هەبوون ولێیان نەتۆقیبوون.

بێگومان من باسی ئەو سۆفیانەش ناکەم کە بوونە پاڵپشتی هێزە داگیرکەرەکان لە کاتی داگیرکردنی ئینگلیزی و فەرەنسی، بەڵام خۆفرۆشی لەناو چەندین چین و توێژیش روویدەدا، وبەشێکی کەوتبوە ناو مودەعیەکانی ئەهلی تەسەوف. کە بەبێ ئەوەی خەڵک وموریدانیان سەرقاڵی ئەو جەوە جەنگاوەرە بکەن، لە کاتی پێویستی نیشتیمان بە ئازایانەترین شێوە بەرەنگاری داگیرکەران بوونەوە.

٥- بێگومان خەڵکانیتری ناموسڵمانیش لەسەر ئاستی تاك ودەوڵەت زۆر بە چاوێکی دژەوە سەیری بابەتی جیهاد دەکەن لە ئیسلامدا، بێگومان ناهەقیش نین، چونکە کە سوپای ئیسلام هاتە سەریان سێ بژاردەی یەك لەیەکتری تاڵتریان لە پێشە: یان بە زەبری ترس و شمشێری هەڵکێشراو دەبێت ببنە موسڵمان، نەک بە ئیقناع و تێگەیشتن، وەک دەزانین تەنها سێ ڕۆژیان مۆڵەت لە پێشە، کە بەشی بیر لێکردنەوەش ناکات! یان دەبێت سەرانە بدەن، کە مانای خۆبەدەستەوەدان و سەربەخۆیی لە دەستدانە، و بە هەموو کەسێك قبوڵ ناکرێت بە زەلیلی سەرانە بدات! یانیش دەبێت بچنە شەڕێکی دەست ویەخەوە،

ئەگەر دۆڕان لە شەڕدا خۆیان دەكوژرێن و ژن ومنداڵیشیان وەك كۆیلە وبەندە دەستیان بەسەردا دەگیرێت! باشە چۆن مەسیحی و جوولەكە و بودایی و هیندۆسی و وەسەنی وئەرواحیەكان نەتۆقێن لە جیهادی ئیسلامی؟! چۆن وەك دەڵێن ئینگلیز قادیانیەت دروست نەكات بۆ نەهێشتنی بیرۆكەی جیهاد؟! كە دەستە و تاقمی واشیان دروست كرد لە دژی چەمكی جیهاد لە ئیسلامدا، ئەو كاتە دەڵێن بڕوانن دوژمنانی ئیسلام چۆن دژی جیهادن؟! هەتا محمد سعید رمضان البوطی میانڕەویش وادەڵێت! ئەی چۆن دژی نەبن كە لەو چەمكەدا نەمانی خۆیان ببینەوە؟! هەر لەبەر ئەو وێنەیە زهنیەی لە مێشكی خەڵک دایە لە بارەی موسڵمانان و ئیسلام وەك دینێك بە غەیری ئیسلامبوونی هەموو دنیا لەكەس ڕازینابێت و بۆی بلوێت غەزا لە دژیاندا دەكات و پیاوانیان دەكوژێت و ژن ومندالانیان بە كۆیلە دەبات، و لەبەر هەندێک لەو كردە خوێناویانەی گروپە ئیسلامیەكانی ناو كەمایەتیە ئیسلامیەكان، خەڵكی ئەو وڵاتانە زۆر بێ ڕەحمانە ونا مرۆییانە ئەو كەمایەتیە ئیسلامیانە دەچەوسێننەوە و جەنگی لەناوبردنیان لەگەڵدا دەكەن.

## ئیسلام وەك ئاینێكی جەنگاوەر

# بەشی چوارەم

## ئیسلام وەك ئاینێكی جەنگاوەر

ئایە دەبێت لە كاتێكدا جیهان هەمووی باسی پێكەوەژیانی و خۆشەویستی بكات و ئیدانەی شەڕە ئاینیە كۆنەكانی بكات، وەك مەسیحیەكان و پاپاش كردویانە، ئێمە لە فورسەت بین بۆ زیندووكردنەوەی شەڕی ئیسلام و كافران.

دنیا هەمووی باسی ئازادی مرۆڤ و تەقدیسی كەرامەتی مرۆڤ بكات، ئێمەش باسی سیستمی بەندایەتی بكەین و لەو سەردەمە مرۆڤ بكەینە كۆیلە وكەنیزەك.

دنیا هەمووی باسی یەكسانی ژن و پیاو بكات، ئێمەش، هەر بە نیوە بەشەر بڕوانینە ئافرەت، بە دەیان پاكانەی لاواز، لە بەرامبەر ئەو ڕاستیانەی كە لە بەشەكانی پێشوو باسمان كردن، بۆ ڕزگاربوون لەو جەوە جەنگاوەریە و ئاكامەكانی، و ئاسایی كردنەوەی ناخ و ڕووحی دینداری موسڵمانان بە گشتی و گێڕانەوەی ڕەهەندی ڕووحی دینداری و ئاشتیخوازانەی دین، و لە پێناو ئاشتبوونەوە لەگەڵ خودی خۆمان و جیهاندا، وبۆ ئەوە قبوڵ بكرێین لە جیهاندا، و تا نەڕوانینە هەموو جیهان بە چاوی دار الحرب و، ئەوانیش وەك كەسانێكی دوژمنكار و خۆ مەڵاسدەر بۆمان نەڕوانن، موسڵمانان چەند بژاردەیەكیان لە پێشە، كە بەبێ ئەو چارەسەرانە جیهانی ئیسلام هەردەم لە بازنەی توندوتیژی دەخولیتەوە و قەت ڕزگاری نابێت، و ئاكامەكەشی ئەگەر وابروات دەبیتە هۆی كارەسات وموسیبەتی گەورە بۆ سەر جیهانی ئیسلامی، چارەسەرەكانیش بە ڕای مندا ئەوانەن:

## 1- بە مەرحەلی ڕوانینە بەشێك لە دەقەكان

بەڕای من جیهاد بە چەمكە جەنگاوەریەكەی چەندە زیانی بۆ [دوژمنانی ئیسلام] هەبووە، هێندەش زیانی بۆ موسڵمانان هەبوە. ئەگەر لە سەرەتادا سوودیشی بو بێت وەك ئەحكامێكی مەرحەلی بۆ پاراستن و جیگیربوونی ئیسلام، كە هەشی بوە، چونكە كە دەڕوانینە ئایەتەكان دەبینین هەموویان پەیوەستن بە كات و هەلومەرجی شەڕەكانی ئەو قۆناغە، كە قۆناغی دامەزراندن بوو بۆ ئیسلام، نەهاتووە بۆ ئەوەی ئومەتی ئیسلام شەو ورۆژ لە جیهاد وشەڕ و كوشتن

و مەرگ دابێت وەك دەڵێن تا دەمارێك لەلاشەمان ترپە بكات. نەك هەر دەقەكانی جەنگ وجیهاد، بەڵكو دەبیت هەموو ئەنجامەكانیشی وەك بە كۆیلە كردنی ئادەمیزاد، و كڕین وفرۆشتن پیكردنی وهەموو ئەو كارانەی كە دەبیتە هۆی شكاندنی شكۆی ئادەمیزاد بە دەقگەلێكی مەرحەلی و تایبەت بە كاتی خۆی سەیر بكرێت. هەر ئەو ڕوحیەتە جەنگاوەریشە كە تەواوی مێژووی ئیسلامی خوێناوی كردوە و تاپۆی كردوە لەسەر جەنەراڵەكانی عەسكەر، و ڕێگای بە مەدەنی بوونی لە گەلانی موسڵماندا گرتوە.

## 2- خوێندنەوەی ئایەتەكان لە سیاقی گشتی خۆیدا

بۆ نمونە سەیركە ئەو دوو ئایەتەی سورەتی البقرة:

**(واقتلوهم حيث ثقفتموهم..... وقاتلوهم حتى لا تكون فتنة ويكون الدين لله)**

بڕوانە كاتێ فەقیهە كۆن و نوێكان تەنها بەشێك لەو ئایەتانە دەردەهێنێت بۆ نمونە پێ هێنانەوە، تۆ وەدەزانیت وەك ابن القيم و سيد قطب دەڵێن: ئەوە جاڕدانی شەڕی سەرتاسەری ئیسلامە دژی هەموو كوفری جیهان، وئیسلام پڕۆژەیەكی جەنگاوەری نەبڕاوەیە! بەڵام كە دەچیتەوە سەر كۆی ئایەت وچیرۆكەكە دەبینیت وانیە، وئەو دوو پارچە ئایەتە لە كۆنتێكستی خودی ئایەتەكە و كۆی چوارجێوەی ئایەتەكانیتردا دەرهێنراوە تا مانایەكی جیا لە مانای خۆی بداتە بە دەستەوە! دەبوایە ئەو هەڵەیە ئەگەر لەسەر ابن القيم و زانایانی تری كۆنیش تێپەڕیوایە، نابا بەسەر ئەدیبێكی بلیمەتی گەورەی وەك سيد قطب تێپەڕیوایە، خاوەنی التصوير الفني في القرآن و في ظلال و افراح الروح، چونكە دەبوایە وەك ئەدیبێكی هەستیار بیزانیبایە دەرهێنانی بەشیك لە دەق لە كۆی

دەقەکان وبەبێ ڕەچاوکردنی پاش وپێشی و چوارچێوە مەعنەویەکەی چیرۆکەکە، چەند دەقەکە دەشێوێنێت.

بۆ نمونە: واقتلوهم حيث ثقفتموهم، [لە هەرکێ پێیان گەیشتن بیانکوژن] لە پێشیدا [**وقاتلوا في سبيل الله الذين يقاتلونكم ولا تعتدوا ان الله لا يحب المعتدين**][ ( 190 ) بجەنگن لە پێناوی ڕێگای خوادا دژی ئەوانەی کە دژتان دەجەنگن، نەکەن دەستدرێژی بکەن چونکە بەڕاستی خوا دەستدرێژکەرانی خۆش ناوێت.]

کەوابوو هەردوو سەری ئایەتەکان دەیسەلمێنێت کوشتاری بێباوەڕان بەندە بە دەستدرێژی ئەوان. هەروەها لە [**وقاتلوهم حتى لا تكون فتنة ويكون الدين لله**] ( 193 ) (بجەنگن دژیان تا وەکو فیتنە و ئاشوب و ناخۆشی نەمێنێت، هەروەها تا دین و ئاین هەر بۆ خوای گەورە بێت] هەر لە تەواوکەری ئایەتەکە دەڵێت: فان انتهوا فلا عدوان الا على الظالمين [ خۆ ئەگەر کۆڵیانداو وازیان هێنا، ئەوا هیچ جۆرە دژایەتیەکیان نامێنێت تەنها دژ بە ستەمکارەکانیان نەبێت.] دین بۆ خوا بوون، وای بۆ دەچم، هەر کەسەی کە عیبادەت دەکات بۆ خوایەتی، وخودا لە ڕۆژی دواییدا پێمان دەڵێت، عیبادەت ودینی کام خەڵك بە ڕاستی بۆ خوابووە! وەك ئەو دروشمەباوەی نێوەندە عەرەبیەکان، کە دەڵێن: [**الدين لله و الوطن للجميع**] دین بۆ خوایە و نیشتیمان بۆ هەموانە.

لە پێشی ئەو بەشە ئایەتەش دەڵێت: [فان انتهوا فان الله غفور رحيم ] ئەگەر وازیان هێنا، خودا بەخشندە ولێبوردەیە.

کەوابوو ئایەتەکان سەرەڕای ئەوەی پابەندە بەو قۆناغە و وەڵامدانەوەی پێویستی ومەترسیەکانی ئەو کاتەیە، هەتا لە حاڵەتی باوەڕ نەبوونت بە مەرحەلی

بوونی ئایەتەکەش، ئەو چەمك و ڕەهەندە ترسناکەی کە لە ئەبەدیکردنی جیهادی موتڵەق و ڕەها کردنی شەڕ وشۆڕ بە دەستەوە نادات هەرگیز! ناکرێت تۆ ئیسلام وێنا بکەیت وەك دینێکی جەنگاوەری بەردەوام هەردەم لە بۆسەدا ولە شەڕدا و لە هێرش کردنە سەر هەموو جیهاندا بێت، پێویستە ئەو ئایەتانە وەك چەندین ئایەتی تری مەرحەڵی کە ئێستا پەیوەندیان بە واقیعدا نەماوە مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێت.

## 3- پێشخستنی بەرژەوەندی [المصلحة] بەسەر هەموو بەڵگەکانیتری تەشریع

ئەوە چارەسەری (نجم الدين الطوفي) يە کە لە فەقیهە گەورەکانی سەدەی حەوتەمی کۆچیە، وخۆی حەنبەلی بوو، بەڵام تێڕوانینی هێندە کراوە و پیشکەوتوخواز بوو دەتوانین بڵێین کە بە دەیەها سەدە پیش کات وسەردەمی خۆی کەوتبووەوە، هەر بۆیەش لەبەر بیرۆکەکە بوێرەکەی لەمەر مەسڵەحەت و پێشخستنی بەسەر هەموو بەڵگەکانی شەرع دووچاری کێشەی زۆر هات، وەک عادەتی سەلەفیەت تاوانبار کرا بە شیعەبوون، وبەبێ دینی وهەزاران تۆمەتی بێ بنەمای تر. قسەکرن لەسەر نەجمەدین تۆفی چەندین وتاری پێویستە، بە نیازم لەو زووانە بابەتێی تێروتەسەلی لەسەر بنوسم، بەکورتیەکەی تیۆری تۆفی لە ڕەچاوکردنی بەرژەوەندی دەڵێت:

تۆفی لە وەوە دەست پێدەکات کە شەریعەت هاتووە بۆ ڕەچاوکردنی بەرژەوەندیەکانی موکەلەفەکان وەك هەموو فوقەهاکان دەڵێن. بەڵگەشی بۆ ئەوە زۆرە، بەڵام تەرکیز دەکات لەسەر حەدیسی [لا ضرر ولا ضرار] ودەڵێت ویستی خوا ئەوەیە کە زیان بە ڕەهایی دووربخاتەوە لە مرۆڤ بەبێ هیچ شەرت وقەیدێك، بۆ ئەوەی بەرژەوەندی مرۆڤەکان زامن بکات، جا چونکە مەبەست و

ئامانجی باڵای شەرع بەرژەوەندییە، کەوابوو بەرژەوەندی شای بەڵگەکانە و بەڵگەی بەڵگەکانە، ناکرێت هیچ بەڵگەیەکیتر پێشی کەوێت. کەوابوو بەرژەوەندی بەهێزترین بەلگەیە و سەربەخۆیە بە خودی خۆی، بە پێچەوانەی فەقیهەکانی پێشوو کە دەیانگووت: [بەرژەوەندی تەنها لە نێو قورئان وسونە دایە]، تۆفی گووتی نەخێر بەرژەوەندی بەڵگەی هەرەبەرزە وسەربەخۆیە [قائم بذاتە].

تۆفی گووتی بەرژەوەندی لە هەر نۆزدە دەلیلەکانی شەرع ، کە یەک یەك دەیانژمێرێت، [قورئان و سونە و ئیجماع و قیاس و قسەی سەحابە، و الاستصحاب، المصالح المرسلة، هتد.. دەڵیت ئەو دەلیلانە جیاوازی وناکۆکی تیدایە، بەڵام بەرژەوەندی هیچ ناکۆکی لەسەر نیە با دەستی پیوە بگرین، ئینجا دەڵێت بە هیزترین بەڵگەکانی شەرع النص و الاجماع ە، واتە قورئان وسونە و ئیجماعە، دەکرێت ئەو دوو بەڵگەیە پێچەوانە بکات لەگەڵ بەرژەوەندی، لە حالەتی پێچەوانەکردندا، پیویستە بەرژەوەندی پێشبخرێت بەسەر دەق و کۆدەنگی [النص و الاجماع] کەوابوو بەرژەوەندی بە پێش هەر دەقێك دەخات هەر جۆرێك بیت قورئان بێت، یان سوونە بیت، زەنی بێت، یان قەتعی وهتد...

بەڕای من تۆفی دەبوایە لە ئاستی ئیبن خەلدوون و ئیبن سینا و ئیبن روشد و ئەبو حامیدی غەزالی ناوی هاتبا ، نەك وا نەناسراو بیت، کە پێموایە بەشێک لە هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو جەنگەی کە لە دژی بەرپا کرا پاش گوزارش کردن لەو ئیجتیهادە بوێر وبی وێنەیەی کە نە لە پێش ئەو ونە لە پاشی ئەو فەقیهێك جورئەتی وتنی شتێکی وای کردووە.

پاش ئەوەی موسڵمانان لە هەموو جیهان بەدناو بوون بەدەست ئەو جیهادیانەی کە خەریکە دەبنە هۆی لەناوبردنی موسلمانان، کە سەرەڕای لاوازیشیان و دواکەوتوویشیان بە ڕاشکاوی دەلێن ئیمە فەرمانمان پێکراوە کە بە ڕەهایی شەڕ لەگەڵ هەموو گێتی بکەین تا دەڵێن اشهد ان لا اله الا الله، و اشهد ان محمدا رسول الله، دەنا خوێنیان حەڵالە بۆمان! بەرژەوەندی وادەخوازێت ئیسلام ڕزگار بکریت لەو ڕوحیەتە جەنگاوەرەی کە بەڕای من سەپێندراوە بەسەری، لە ئەسڵدا خۆی تەنها بۆ قۆناغی دامەزراندن تەشریع کراوە بۆ پاراستنی ئیسلام، پاش بڵاوبوونەوەی لە سەدان دەوڵەت و لە نێوان زیاتر لە ملیارێك و دوو سەد ملیۆن کەس، ئیسلام هیچ کاری بە جیهاد و شەڕ نەماوە کە سیمای ڕووحی دینەکەی شێواندوە خەریکە لە جیهاندا وەك ڕێکخراوێکی مافیاویی تیرۆرستی فاشی سەیری دەکریت کە هەموو مەرجەکانی فاشیزمیەتی بە زیادەوە تێدا دەست بەر دەبێت.

## ئیسلام وەك ئاینێکی جەنگاوەر

# بەشی پێنجەم

## نەسخی زەمەنی

نەسخی زەمەنی یش پێویستە! وەك دەزانین قورئان لە ٢٣ ساڵدا دابەزیوە، ١٣ ساڵی لە مەککە، و ١٠ ساڵی مەدینە، لەو دەساڵەی مەدینەدا کە ئایەتەکانی ئەحکام و معاملات دابەزیوە، چەندین ئایەت بە ڕای زۆربەی زانایانی ئیسلام

نەسخ کراوەتەوە لە پێناو گۆڕانی واقیعدا و هێنانەدی بەرژەوەندی موسڵمانان، ماقوڵە بە درێژایی هەزار وچوارسەد ساڵ هەموو ئەحکامەکان وەك خۆی بمێنێتەوە؟! ئایە مەرجە تەنها پێغەمبەر لە ژیاندا بێت تا نەسخ ڕوبدات، لە کاتێکدا زۆربەی هەرە زۆری ئەو ئایەتانەی کە باس لە نەسخبوونی دەکرێت، دەقێکی ڕوون وئاشکرای لەسەردا نەهاتووە کە لە زەمەنی پێغەمبەر [د.خ] بووە، زیاتر ڕای ئەسحابە و ئیمام و فەقیهە گەورەکانی پاش وەفاتی پیغەمبەرە؟! ئەی بۆ تەنها کە نۆرەی سەردەمی ئیمە هات گووتیان نابیت دەست بۆ نەسخ ببرێت.

ئایە ماقوڵە پێغەمبەر [د.خ] تەمەنی بە قەد تەمەنی ئومەتی ئیسلام بڕ بکات تا نەسخی ئەو ئایەتانەمان بۆ بکات، کە بۆ قۆناغێکی دیاریکراو هاتوون، یان هیچیتر بەرژەوەندی موسڵمانانی لیوە دەستگیر نابێت، یان تێکرای مرۆڤایەتی تەجاوزی ماناکانیان کردوە؟ ئایە دەق واقیع ئاڕاستە دەکات بۆ هەتاهەتایی؟! کە واقیع دابڕا لە دەق، کاری ئێمە هێنانەوەی واقیعە مێژوویەکەیە وەك دیکۆری فیلمی ئیمپڕاتۆریەتە کۆنەکان؟! کە واقیعێك نەما، بۆ دەبێت دەقگەلێکی لە واقیع دابراودا زیندووکەینەوە! ئایە کە خودا لە قورئاندا دەفەرموێت [الیوم اکملت لکم دینکم] مانای عەقیدە و شەریعەت دەگرێتەوە یان دین ئاماژە دەکات بۆ تەنها عەقیدە، بە تایبەتی کە بەڵگەی زۆر هەن کە لە دوای ئەو ئایەتە پێغەمبەر [د.خ] ٨٠ ڕۆژ ژیاوە و ئایەتیش بەردەوامی هەبووە لە دابەزین، بۆ نموونە ئایەتی سوو [ربا] لە پاش ئەو ئایەتە دابەزیوە! ئایە ربا لە دیندا بووە یان نا؟ من لەو قەناعەتەم کە کامڵبوونی دین ئاماژەیە بۆ کامڵبوونی هەموو بەها عەقیدی و ڕەوشتیەکان کە بۆ هەتا هەتایی نابێت بگۆڕێت! دەنا دەبوایە ئەو ئایەتە دواهەمین شت دابەزیبا.

سەرەڕای هۆكارەكانی نەسخ لە قورئاندا كە بە درێژایی لە كتێبەكانی علومی قورئان باسكراوە، لەوە دەچێت خودا میكانیزمێك و هۆكارێكیتریشی بۆ مرۆڤ جێ هێشتبێت كە نەسخی زەمەنییە، بۆیە بەڕای من چاكترین میكانیزم بۆ چارەسەركردنی ئەو كێشانەی بەرۆكی نەتەوە موسڵمانەكان دەگرێت بریتیە لە نەسخی زەمەنی، مەبەست لەو نەسخەش، ئەو مانا و بارودۆخ و مەرجانەیە كە زەمەن وكات تێپەڕی داوە، هیچیتر مایەی قبوڵی مرۆڤایەتی نییە پیادە بكرێن، ئەوەشی پیادەی كرد بە پاڵنەری ئیمانێكی حەماسیانە وكوێرانە ودۆگماتیك، دەبێتە مایەی ڕق ونەفرەتی هەموو كۆمەڵگای مەدەنی جیهان. بۆ نمونە كاتی خۆی پێش هەزار، بەڵكو سەد ساڵ كۆیلایەتی مرۆڤ لە زۆربەی جیهان شتێكی ئاسایی بوو كردنی، بەڵام لەگەڵ پێشكەوتنی كۆمەڵگای مرۆڤایەتی لە بوارە مرۆییەكاندا، وگۆڕینی شەرایت ومەرجەكانی، و قەدەغەكردنی كۆیلایەتی لە سەراسەری جیهان، ناكرێت تۆ بە دژی هەموو جیهان و بە پێچەوانەی بەرژەوەندی هەموو موسڵمانان تەشریعی كۆیلایەتی بكەیت، موسڵمان وەك قێزەونترین مەخلوقی سەر ئەم زەمینە نیشانی دنیا بدەیت لەبەر ئەوەی دەقێك بەر لە ١٤٠٠ ساڵ ڕێگای كۆیلایەتیكردنی پێداویت؟! ئەو دەقە بۆ واقیعێكی كاتی خۆی هاتوە، بۆیە دەبێت لە چوارچێوەی واقیعە مێژوویەكە بخوێندرێتەوە، چونكە كە دیاردەكە نەماوە، خۆ ناكرێت ئێمە بە زۆر زیندووی كەینەوە، پاش ئەوەی هەموو جیهان قەدەغەی كردووە؟! ئنجا شانازیش بەوە بكەین كە ئیسلام ڕزگاركەری بەندەكانە لە عیبادەتی عیباد بۆ عیبادەتی خوا، وەك زوو زوو لە وتار و خوتبە و سیمنارە ئیسلامیەكان دەوترێت؟! زەمەن و سەردەم و كات، لای خودا هێندە گەورەیە سوێندی پێ دەخوات، ودەفەرموێت: [والعصر]. بەڵێ زەمەن ئایەتی مؤلفة قلوبهم ی نەسخ كرد كە دەڵێت: [**نَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاءِ وَالْمَسَاكِينِ وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا وَالْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ ....**] التوبة -

الآية 60 [ بێگومان زەكات تەنها بۆ هەژارو نەداران و ئەو كەسانەی كەكارمەندن بەسەریەوە و بەودڵ نەرم بووانە] الْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ واتە ئەوانەی هێشتا موسڵمانیش نەبوون، بەڵام دڵیان بۆی نەرم بووە، یان ئەو موسڵمانە نوێیانەی كە هێشتا ئیمان جێگیر نەبووە لەدڵیاندا] ئەوانە پشكێكی دیاریكراویان هەبوو لە زەكاتدا، دوایی لەگەڵ تێپەڕبوونی كات، بە مردن و دەوڵەمەندبوون، وئیمان جێگیربوون، وبڕیاری حەزرتی عومەر، ئەو ئایەتە هیچیتر پێویستی و كارپێكردنی نەما لە واقیعدا، واتە ئایەتەكە زەمەن نەسخی كردەوە، چونكە هیچ ئایەتێكی تر نەهاتوە بۆ نەسخ كردنەوەی! چونكە دڵ نەرمكراوەكان نەوەیەك بوون و بەسەر چوون! هە موو ئایەتەكانی [في الرقاب ] [العبد] و [وماملكت ايمانكم] بە شێوەیەكی زەمەنی نەسخ بۆتەوە لە هەموو دنیا، رەنگە بەس لە موسڵ و ڕەقەی داعش مابێت بەس.

دەشبینین چۆن تێكرای جیهان دژی داعیشە لەبەر زیندوكردنەوەی ئەو فەرهەنگە مردوو و بەسەرچووە بە حەماسەتێكی دەبەنگانە! بە هەمان شێوەی ئەو نمونانەی سەرەوە زەمەن دەتوانێت ئایەتی تری موعامەلات و ئەحكام نەسخ بكات، زەمەن دەتوانێت ئەو ڕوحە جەنگاوەریە داماڵێت لەو ئایەت وحەدیسانەی جیهاد كە بۆ قۆناغێكی كاتی هاتوون، هەر ئەو هۆكارە زەمەنیەش دەتوانێت ئیسلام لە كەلكەلەی كۆیلەداری و بە نیوەزانینی ژن و ڕەجمی زیناكەران [هەرچەندە ڕەجم لە قورئانیشدا نیە] و بڕینی دەستی دز، كە ئەمرۆ كەمئەندامان لە وڵاتانی پێشكەوتوو دەوڵەت هەموو خەرجیەكیان دەكێشێت، و چەندین بابەتیتر ڕزگار بكات، ئەگەر موسڵمان بیەوێت بگونجێت لەگەڵ سەردەم و مایەی قبوڵی دنیا بێت، و تا مرۆڤی موسڵمان لەزەت لە عیبادەت ودینداری بكات، تا ئیسلام هیچیتر وەك ڕێكخراوێكی جەنگاوەری وێنا نەكرێت.

خودا چەكی بەرگری داوەتە لاوازترین مێشولەش، موسڵمان پێویستی بەو هەموو تەوجیهاتە و فقهی جیهادە نیە، تا بزانێت چۆن بەرگری لە خۆی دەكات، ئەوە كاری سیاسەت و دەوڵەتە، ئەمریكا و ئەوروپا وڕوسیا لە هەموو كلتوری دینیان یەك ئایەتی جیهادیان نیە، كەچی هێندە بەهێزن دەتوانن هەموو جیهانی ئیسلام بە چاوتروكانێك لەناوبەرن! ئیمام محەمەد عەبدە قسەیەكی زۆر نایاب دەكات لە كتێبی: الاسلام بين العلم والمدنية، دەڵیت: ئەوەی بروانێتە ئسوڵی دینی ئیسلام و سورەتێكی لە كتیبەكەی بخوێنێتەوە، دەگاتە ئەو حوكمەی كە بێگومان دەبیت ئیماندارانی یەكەم نەتەوەی جەنگاوەربن لە جیهاندا ، وپێش هەموو میللەتانی تر كەوتبن لە داهینانی ئامراز وچەكی كوشندە، و زانست و كارامەیی سەربازیدا، ... بەڵام مرۆڤ تووشی سەرسوڕمان دەبێت كە دەبینێت لە هیچ لەو پیشەسازی و زانستانە كارامە نین، هەتا هەموو نەتەوەكانیتر لەوان سەركەوتووترن لەو بوارەی كە دەبێت باڵادەستی بۆ ئەوان بێت!" بەڕای ئیمە هێشتنەوەی هەندێك كێشەی زۆر هەستیار بەبێ جارەسەرێكی برەر و یەكلایی كەرەوە، ئەگەر باوەڕمان بە بێ سنووری زانستی خوا هەبێت بە رابردوو وئێستا وئایندە، دەگەینە ئەو راستیەی كە خودا پرسگەلێكی وەك بۆ نموونە كۆیلایەتی و سزا توندەكانی وەك ڕەجم و دەستبرین و هتد، بۆ بژاردە و هەل ومەرجی موسڵمانانی جێهێشتووە بە پێی میكانیزمی جۆراوجۆری وەک، رەچاوكردنی بەرژەوەندی گشتی موسڵمانان، كە نەجمەدین تۆفی دۆزیەوە، هەروەها بۆ نەسخی زەمەنی كە ئێمە لەو وتارە باسمان كرد، دەنا ماقول نییە موسڵمانانی جیهان شەرم لە باسی كۆیلایەتی بكەن، خودا نەزانێت ڕۆژێكی وا بەسەر جیهاندا دێت كە ئەو چەند ئەحكامە مەرحەلیانە ئیحراج بۆ موسلمانان دروست دەكات! بۆیە گومانم نیە لەوەی كە خودای گەورە بڕیاردانی ئەو ئەحكامانەی جێهێشتوە بۆ ئیجتیهاداتی موسڵمانان، بەڵام زانایانی ئیسلام لە

كۆنەوە زۆربەی هەرە زۆریان زاتی ئەوەیان نەكردوە وابیركەنەوە، هەتا ئەوەی واش بیری كردبێتەوە بە تێكڕا هێرشیان كردۆتە سەر تا دەمكوتیان كردوە یان تووشی گۆبەندی گەورەیان كردوە، بە جۆرەها تۆمەتی نا قۆڵا تۆمەتباریان كردوە. لە پاش ئەو كارەساتانەی كە ئیسلامی جیهادی و ڕوحی جەنگاوەری ناو دەقەكان دووچاری ئەو ئومەتەی كردوە كە بۆتە هۆی ڕاكشانی ڕوحی بی دینی و ئیلحادی لە سەرانسەری جیهانی ئیسلام، دەبێت چارەسەرێكی رادیكاڵانەی ئەو كێشانە بكرێت، ودین هیچیتر نەبێتە بارمتەی مێژوو وتێگەیشتنی سەقەت و ترسنۆكی ئیجتیهادكردن. با دین دووركەینەوە لەو ڕوحە جەنگاوەریەی كە وەبەردەهێنرێت لەلایەن ناحەزانی ئیسلامیش، با ڕوحی دینداری و ڕوحانیەت ئاشت كەینەوە لەگەڵ ئیسلامدا. ئەگەر دەڵێن جیهاد بۆ لادانی بەربەستەكانی پێش بانگەوازی ئیسلامە، ئێستا هیچ بەربەست نەماوە لە دنیا لە سایەی تەكنۆلۆژیای كافران، دەتوانیت بە كەیفی خۆت پەیوەندی بە قوتبی شیمالی وجنوبی بكەیت بۆ بانگەوازكردنیان بۆ ئیسلام.

# بەشی شەشەم

## چۆن كورد ڕزگاری دەبێت لە ژێر كاریگەری فۆرمی عەرەبی بۆ ئیسلام

بەڕای من سۆفیەت لە بنەڕەتدا كە دروست بوو، هەوڵێك بوو بۆ قووڵبوونەوە لە لایەنی ڕووحی و مەعنەویات، جۆرێك لە یاخیبوونی بێ دەنگانە بوو، لەو ڕوحیەتە جەنگاوەرەی كە زاڵە بەسەر كۆی دەقەكانی ئیسلامدا، وەك لەو پێنج بەشەی " ئیسلام وەك ئاینێكی جەنگاوەر" باسم كردوە.

هەروەها ئەنجامی کارلێکەری عەقڵیەتی میللەتانی نا عەرەبی و عەرەب بوون. بۆیە کە دەڕوانیتە کەسە هەڵکەوتوەکانی تەسەوف لە زۆربەی هەرە زۆریاندا عەرەب نین. میللەتانی ناعەرەب تووشی شۆك هاتن كە بینیان هەڵمەتی سوپایی گەورە وەك گەردەلوولەی بیابان دێت بۆ سەریان بە ناوی دین و لە ژێر دروشمی دینیدا! چونكە بەرلەوە هێرشەكان هەر بە ناوی ئیمپراتۆریەت و دەوڵەت و سیاسەتی داگیركردن و ڕووتاندنەوە دەهاتن، وەك هەڵمەتەكان و شەڕەكانی دەوڵەتی ڕۆم وفارس، هەرچەندە قورئان دەیەوێت ڕەهەندێكی دینی بداتە ئەو شەڕانە، وەك شەڕی مەجوسیەت و ئەهلی كیتاب باسی دەكات، و دەڵێت موسڵمانان حەزیان بە سەركەوتنی ڕۆمەكانی ئەهلی كیتاب دەكرد! بەڵام لە هەقیقەتدا ئەوە تەنها شعوری موسڵمانان بوە كە لە زووەوە تەفسیری دینیان بۆ هەموو ڕووداو و دیاردەیەك كردوە، دەنا ئەو شەڕانە لە ژێر هیچ دروشمێكی دینیدا نەدەكرا، وەك شەڕ و غەزای موسڵمانان.

سۆفیەت هەر بۆیە زۆر زوو دەركەوت لە گۆڕەپانی ئیسلامدا، ویەكەم كەس كە ناونرابێت سۆفی وەک لە قسەكانی ابن تيمية و"كشف الظنون" هاتوە [ أبو هاشم الصوفي] كە لە ساڵی سەد و پەنجای كۆچی ١٥٠ هـ وەفاتی كردوە.

بێگومان كوردیش ڕۆڵی كاریگەری هەبوو لە دەركەوتنی سۆفیەت وگەشەكردنی، شێخ عەبدولقادری گەیلانی و مەولانا خالیدی نەقشەبەندی وسوهرەوەردی كوردبوون ، كە ئەوانە بە كەسە هەرە دیارەكانی ئەو مەیدانە دادەنرێن، جگە لەو كەسایەتیە سۆفیانەی كە سەرەرای مەزنایەتیان، بەڵام شوهرەتیان هەر لە ناو كوردستان مایەوە، وەك مەلای جزیری و مەحوی و ئەحمەدی خانی وگەلێكیتر.

تەریقەتی سۆفی دیاردەیەکی ئیسلامی گشتی بووە، بەڕای من تەنها شێوازی دینداری کورد نەبووە، بەڵکو زۆر لە کۆمەڵگا ئیسلامیەکانی عەرەبی و فارسی وئەفغانی وهیندستانی وئەفریقایی و مەغریبی وئەندەلوسی تەریقەت لە ناویاندا باو بووە. ئینجا دوو تەریقەتی تەسەوف کە هەبوویێت لە ناو کورددا، تەریقەتی قادری و نەقشەبەندی بوون، یەکەمیان هەتا ئەگەر خاوەنەکەشی کورد بێت، بەڵام لە کوردستان لە دایك نەبوو، بەڵکو لە بەغداوە دەرکەوت وبڵاوبۆوە وگەیشتەوە کوردستان لەوێوە! نەقشەبەندیش هەر لە بوخارا وهیند دەرکەوت، مەولانا بەپێی خۆی چوو بۆ هیندستان و لە شاە عبداللە ی دهلەوی وەریگرت و هێنای بۆ کوردستان، هەرچەندە مەولانا خالید ئیزافاتی خۆشی خستە سەر تەریقەتەکە و سەرلەنوێ بنیاتی نایەوە، و ئەو قۆناغەی تەریقەتەکە بە ناوی ئەو ناونرا: نەقشەبەندی خالیدی! لەبەر ئەو هۆیانە من بە ڕەهایی لەو باوەڕە نیم کە دینداریەکی تایبەت بە کورد بێت، بەڵام دەکریت بڵێین کە تەسەوف نزیکترین شێوازی دینداریە بۆ دەروون و نەزعەی دینداری کوردی، لە سوودەکانی تەریقەتی نەقشەبەندیدا: نووسەری کتێبی النقشبندية نشأتها وتطورها لدي الترك، الدکتورة بديعة محمد عبد العال، الطبعة الأولی القاهرة ، الدار الثقافية للنشر، 2009، ص22: 28، دەڵێت: بە دەرکەوتنی مەولانا خالیدی نەقشبەندی، گیانی زوهد ودینداری زۆر بڵاوبوەوە و ڕێژەی تاوان و دزی و راوەڕووت و ڕێگری زۆر کەم بوەوە لە ناوچە کوردیەکان، ودەڵێت کاریگەری ڕابیتەی سۆفی ڕۆڵێکی گرنگی بووە لە هێورکردنەوەی ئەعسابی خەڵك و دوورکەوتنەوە لە خاتیرەی شەڕ و دووژمنکاری لە دەروونی مرۆڤایەتی! لە ژێر کاریگەری ڕێنوێنی وتەعالیمەکانی مەولانا.

ئینجا تەریقەت توانی خەڵك بپارێزێت لە هیرشی مەزاهیبی توندرەوی سەلەفی، چونکە ئەگەر سەلەفیەت بگەیشتبا کۆمەڵگای کوردی، کوردیش خۆی سروشتێکی جەنگاوەرانەی هەڵچووی هەیە، ئەو کاتە کۆمەڵگای کوردی دەبووە داخراوترین و توندڕەوترین کۆمەڵگای ئیسلامی، ودەبوایە سعودیە بێت لە ئێمەی کورد فێری توندڕەوی بووایە، وەك چۆن ئێستا کەسانێکی توندڕەوی خۆمان لەوێوە تووندرەویمان بۆ هاوردە دەکەن، تازە بە تازە باسی حەڕامێتی سەیارە لێخوڕین و ناردنی کچ بۆ خوێندنی زانکۆ، ودەم وچاو دەرکەوتنی ئافرەت دەکەن.

سەرەڕای ئەوەش ئەگەر دەسەڵاتی سیاسی کوردی زیرەك بوایە، کە قەت نەبووە، دەیتوانی سەرەڕای ئەمن وئاسایشی کۆمەڵگا کە ئەو تەریقەتە دابینی دەکرد، سوودێکی زۆری لەو گوێڕایەڵی سەرتاسەریەی بۆ قسەی مەولانا خالید بکردبایە بۆ یەک دەنگی کورد و پڕۆژەی بنیاتنانی دەوڵەتێکی فراوانی هەموو کوردستان بگرێتەوە، بەڵام بە پێچەوانەوە وەك شێخ عەبدولکەریم مودەریس ئاماژەی پیدەکات، کە دەسەڵاتی بابانەکان تۆقیبوون لەبەر گوێڕایەڵی خەڵك و خۆشەویستی خەڵك بۆ مەولانا خالید، هەر بۆیەش ئاگری دووبەرەکێی هەردوو تەریقەتی قادری ونەقشەبەندیان گەرمتر دەکرد، تا ئەو ڕادەیەی مولانا بە ڕاکردن ڕای کرد لە سلێمانی، بۆ ئەوەی هیچیتر کێشەکان پەرەنەستێنن، وپاشاکانی بابان یش تەنها وەك تەماشاکەرێك دویانڕواننیە ئەو هەموو کێشە وبیشەیە بێ ئەوەی هەوڵی چارەسەرکردنی بدەن.

مەولانا وادەردەکەوێت وەك کوردە هەڵکەوتوەکانیتر نەبوو، کە گەیشتە بەغداد، کوردستانی لە بیربچێتەوە، بۆیە سەرەڕای ئەو ناوناوبانگەی لە بەغدا دەریکرد و هەزاران موریدی لە دەورە کۆبوونەوە، بەڵام لە یەکەم دەرفەتدا

کاتێ محمود پاشای کوری عبدوڵرەحمان پاشای بابان داوای گەڕانەوەی کرد بۆ سولێمانی، یەکسەر گەڕایەوە لە دەوروبەر ١٢٣٠ هـ دا. دوایێ جارێکیتر هەمان بەزمی پێدەکەن تا لە ١٢٣٦ هـ جارێکیتر ڕادەکاتەوە بەغدا و دوایش بۆ دیمەشق، کە هێندە شوهرەت وڕیزدار وپایەدار دەبیت لەناو خەڵکدا، هەتا خەلیفەی عوسمانی لیی دەکەوێتە گوومان ونامە بۆ والی بەغدا دەنیرێت دەربارەی نیازی سیاسی مەولانا خالید!! خوا خێری والی بەغدا بنوسێت کە بەرگریەکی جوانی لێدەکات لای خەلیفە، دەنا لە بەغداشیان وەدەر دەنا! کەوابوو هۆکاری سیاسی و جیاوازی تەریقەتی نێوان قادری ونەقشەبەندی ببوە مایەی نارەحەتی وپشێویەکی زۆر لەناو کۆمەڵگای کوردی! ئەگەر لەسەر دەستی مەولانا خالید ئەو یەکێتیەی چین وتوێژەکانی کورد لەسەر ڕێڕەوی تەریقەت دانەمەزرێت، ئەوە لە نەبوونی ئەوە ڕاستە تا ڕادەیەکی زۆ کە تەریقەت لایەنی پۆزەتیڤی زۆری هەبووە بۆ کۆمەڵگای کوردی، بەڵام وەك هەر شتێك تەریقەتی سۆفیەت لە ناو کوردا لایەنی نێگەتیڤیشی هەبووە، لەبەر خەلك مەشغولکردن بە زیکر وئەوراد و عیبادەتی زۆر، زیاتر ئەو شێوازە دینداریە گونجاوە لەگەڵ کۆمەڵگای کشتوکاڵی کوردی، ئاسان نییە گونجانی لە ژیانی هاوچەرخدا، دووەم ڕۆڵێکی ترسناکی گێڕاوە لە بڵاوبوونەوەی نەخوێندەوار و جەهل لە کاتی خۆیدا، چونکە هەموو بایەخەکان بۆ لایەنی رووحی ودەروونی بوو، لایەنی فێرکاری بە تەواوی فەرامۆشکرا بوو لەو تەریقەتانە. تەنها بۆ نوخبەیەك نەبێت.

یەکیکیتریش لە لایەنە نێگەتیڤەکانی تەریقتی تەسەوف لە ناو کوردا، خراپ بەکارهێنانی شێخەکانی تەریقەتە بۆ تەعالیمەکانی تەریقەت کە دەڵێت مورید لەگەڵ شێخەکەی یان لەگەڵ مورشید دەبێت هێندە گوێڕایەڵ و مل کەچ بێت، وەك مردوو بێت لە ژێر دەستی مردوو شۆر!! یانی هیچ بیرورا و کەسایەتی

و کەرامەتی نە بێت، چی پێگووترا جێبەجێی کات، ئەو شتەش زیاتر قوڵدەکرێتەوە لە ڕێگای جۆری زیکرەکانی تەریقەت وەك لە نەقشەبەندیدا دەبێت مورید ڕوحی مورشید بهێنێتە بیری خۆی کاتێ زیکر دەکات، مورشیدیش ڕوحی پێغەمبەر [د.خ] و پێغەمبەریش خوا.

هەموو کەسێکیش مەولانا نییە ئیستیغلالی ئەو ملکەچیە و لاشە مردوە وبێ دەسەڵات وبێ ئیرادەیە نەکات بۆ مەرامە کەسێتیەکانی خۆی، بۆیە شێخەکانی تەریقەتە جیاوازیەکان بە خراپترین شێوە کەرامەتی مرۆڤە شوێن کەوتوەکانی خۆیان دەسڕنەوە، ومرۆڤێکی ترسنۆک وبێ ڕەئی و دەمارگرژی بودەڵە بنیات دەنێن، کە هەموو ئاواتی ئەوەیە دەست وپێ و کەوشەکانی شێخەکەی ماچ بکات! ئەوە لە کاتێکدا لە ئیسلامدا ئەو مرۆڤ پەرستیە نییە، وپێغەمبەر پەرستیش نییە، بەڵکو نابێت زیادەڕۆیش لە خۆشەویستی بکرێت، وهەتا قورئان لە چەندین جێگادا جەخت لەسەر بەشەریەتی پێغەمبەر [د.خ] دەکاتەوە، و پیی دەڵێت: قل انما انا بشر مثلکم! واتە بڵێ من تەنها مرۆڤێکم وەك ئێوە! ئەوەش بۆ ئاسایی کردنەوەی وێنەی پێغەمبەرە لە زهنیەتی ئیمانداران.

بۆیە بەڕای من تەریقەتەکان ئەگەر بیانەوێت ڕۆڵێکی کاریگەر بگێڕن لەناو کۆمەڵگای کوردی، دەبێت چاکسازی زۆر گەورە بکەن لە ڕێنوێنیەکانی و جۆرێتی کەسەکانی، و هەوڵی خۆ گونجاندن بدات لەگەڵ ڕۆژگاری هاوچەرخدا، دەنا بەو شێوەیەی ئێستا زۆر زەحمەتە سەرنجی مرۆڤی کوردی دیندار بۆ خۆی ڕاکیشێت. هەرچەندە بەڕای من تەریقەت ناتوانێت بەربەستیەکی تەواو و کاریگەر بکات لە بڵاوبوونەوەی توندڕەوی سەلەفی، چونکە چەندە تەریقەت داوای ملکەچی دەکات لە موریدان وشوێن کەوتووانی بۆ شێخەکان ومورشیدەکان، هێندەش سەلەفیەت دژایەتی ملکەچی دەکات بۆ شێخ و مەشایخەکان، مرۆڤی

کوردیش بە سروشت یاخییە زیاتر، هەرچەندە خەڵکی ئاسایی تێناگەن کە سەلەفیەتیش جۆرێکە لە چەپاندن و کۆیلایەتی کردن بۆ دەقگەلێك بە ناوی دەقی پیرۆزی حەدیس و کۆیلەی دەقە زۆروبۆرەکان، وکۆیلەی قال فلان و حدثنا فلان، بە ناوی گوێڕایەڵی بۆ پێغەمبەر [د.خ] .

بەڕایی من کورد لە کۆنەوە گوزارشی کردوە لە زەرورەتی وجودی مەزهەبێکی سەربەخۆی خۆی، بەڵام لەبەر نەبوونی متمانە بە خۆ، ئەو پرۆژە تا ئەمڕۆش دواخراوە، ئەو راستیە لە زۆر دەقە ئەدەبی و فۆلکلۆریر کوردیەکان ڕەنگی داوەتەوە.

بەڕاستی جێگەی سەرسوڕمانە کە کەسێکی وا بلیمەت لەو سەردەمەدا وا بیری کردبێتەوە و وا پەست بوبێت لە سوونی بوون و داوا بکات گوێ نەدەنە مەلای سوونی! لەو شیعرەی شێخ ڕەزا لەو سەردەمەدا هەستی بەجیاوازی سروشت و ڕوحیەتی کوردی کردوە لەگەڵ مەزهەبی سووننەکان، ئەوەش مانای مەیلداری شیعایەتی ناگەیەنیت، چونکە رای بەرامبەر شیعەش هەر نێگەتیف بووە، بۆیە بە دڵنیاییەوە دەڵێم شێخ ڕەزا هەستی بە پێویستی هەبوونی مەزهەبێکی تایبەت بە کورد کردوە دوور لە سوونە و دوور لە شیعە، وەک چۆن یەمەنیەکان مەزهەبیکی مامناوەندی نێوان شیعە و سوونەیان دروستکردوە بە ناوی زەیدی. خۆزگە زانایانی دینی ئەو سەردەمە بە قەد نیوەی شێخ ڕەزا هەستیار دەبوون، چونکە بەڕاستی جێگای ئەسەفە زانای گەورەی وامان هەیە هەموو ژیانی لە ناو زانستە ئیسلامیەکان سەرف کردوە، کەچی هەر شوێن کەوتەی مەزاهیبە باوەکانە بست بە بست.

ئەمڕۆ خۆشبەختانە ئەو بابەتە زۆر بە شێوەیەکی بەهێز لەناو ڕۆشنبیرانی دینداری کورد دەوروژێنرێت، بەڕای من دەبێت ئەو کارە بە منەوەر و ڕۆضنبیرانی دینداری ناو جەماوەر بسپێردرێت، نەك بە مەلای تەقلیدی کە ناوێرێت قسە لە قسەی فەقیهێکی شافیعیش بکات، نەك ئیمام شافیعی خۆی.

موسڵمانی کورد هەر لە ئێستادا زۆر خاسیەتی عەمەلی وئیعتیقادی تایبەت بە خۆی تێدایە کە دەکرێت کار و توێژینەوەی دەربارە بکرێت، کورد پێویستی بە مەزهەبێکی دینییە:

- کە دوور بێت لەو ناکۆکیە مێژوویە بێ مانایانەی نێوان شیعە وسونە، لە بواری عەمەلیش هەر وایە، کورد هێندە دەربەست بەو مێژووە نیە.
- نزیکتر بێت لە قورئان و هیچ حەدیسێك و قسەیەکی توراسی دینی وەرنەگرێت کە پێچەوانەی قورئان دەکات.
- ئیسلام دابڕێنێت لە ڕوحی جەنگاوەری و بیباتەوە سەر ئەسڵی دینی عیبادەت کردن، و ڕوانینە ئەو دەقانەی کە لەسەر جەنگ وجیهاد هاتوون وەك ئەحکامێکی مەرحەڵی وتایبەت بە قۆناغی چەسپاندنی دین.
- جەختکردنەوە لەسەر تەوجیهاتە مەدەنی ومرۆییەکانی ئیسلام، ڕاگرتنی هەر ئەحکامێکی مێژوویی کە مەشروعیەتی نەماوە وەك کۆیلایەتی و دەستبڕینی دز، وستیتر، چونکە کە دەستت بڕی دەبێتە کەمئەندام، کەمئەندامیش ئەمڕۆ لە وڵاتانی دونیا دەوڵەت ناچارە هەموو نەفەقاتی ژیانی بکێشێت!
- هەڵگرتنی سزا توندەکانی کە لە قورئاندا نەهاتوە وەك بەردباران کردنی زیناکەران و سزای هەڵگەڕانەوە.

ئەوە جەند سەرباسێك بوون دەكرێت زیاتر تێیدا فراونتر باس بكرێت، هیوادارم بەرچاو ڕوونیەكم كردبێت لەسەر چۆنیەتی ڕزگار بوونی كورد لە كەوتنە ژێر كاریگەری نەتەوەكانی تر.

## داعش پەروەردەی باوكانی سەلەفیەتن

داعش پەروەردەی باوكانی سەلەفیەتن نەك  سەید قوتب كە بە بەراوردا بە حەوت ئاو  شوراوەتەوە، خۆشترین شت كە لە بەرنامەكەی ڕەنجی شەممەی ڕابردوو گوێم لێبوو ئەو برگەیە بوو كە عەبدولەتیف سەلەفی گووتی" :داعش

پەروەردەی قوتابخانەی ئەو گرووپ و حیزبە ئیسلامییانەن، کە کاریگەرن بە کتێبەکانی سەید قوتب"، دەشڵێت "داعش بەرهەمی بە سیاسیکردنی ئیسلامە."

ئەوەی ژیانی سەید قوتب بخوێنێتەوە دەزانێت، ئەو کەڵە نوسەر و بیرمەندە لە چ ئاستێکی بەرز بوو لە بیرکردنەوە و تێڕامانی شارستانی کاتێك دوور بوو لە میکرۆبی سەلەفیەت، کە لە ڕێگای چەند تەفسیرێکەوە کەمێکی پێگەیشتوە هەرچەندە بە تەواوی نە کەوتە ژێر کاریگەری، چونکە سەرەڕای ئەوەش سەید نەفەسێکی جوان و ئیسلامێکی لیبوردەی میسری وعەقڵێکی سەلیم و جوانی مابوو، وەك دەزانین دژی مانەوەی سیستمی کۆیلایەتی و جزیە وسەرانە بوو، کە ئەوە کوفری ئەکبەرە لای سەلەفیەکان.

رەخنەی سەلەفیەت لە سەید قوتب وەك هەر رەخنەیەکی ئاسایی نیە، وەک هەر کەسێ لە کەسێکی تری دەگرێت، بەلکو هەوڵدانی ماستاوکردن ومەیلداری کردنی دەعوەی سەلەفیە بۆ فەرمانڕەوا ئیستبدادیەکانی سعودیە وخەلیج دژی هەر هێمایەکی شۆڕش و ڕاپەڕین و گۆڕان.

رەخنەی سەلەفیەکان لە سەید قوتب، ڕەخنەیەکی زانستی ڕووت و دوور نیە لە هەوا وئارەزوو ومەرامی پەنهانی، بەڵکو بۆ درێژەدانە بە ژیان لە ژینگەیەکی هاووێنەی مەملەکەتی بەنی ئومەیەیە، و لەڕێگای ئەو ژیانە دوو نیشانە دەپێکن، کە یەکەمیان ژیانە لەناو مەسەلەکانی ئەسما و سیفات و قەبر وبیدعە، و دوەمیش ژیان بەسەر بردنێکی دوورە لە بقەکانی دەسەڵاتەوە و باسنەکردنیەتی بەهیچ شێوەیەکی نێگەتیڤ.

عبداللطیف و شوێن کەوتوانیشی وەك چۆن کێشە ڕوکەشیەکانی سعودیە وەك وەلی ئەمر و خروج و تەحریمی خۆپیشاندان و قەدەغەکردنی ئافرەت لە

سەیارە لێخوڕین بەبێ هیچ پێویستیەکی ئەو باسانە بۆ کۆمەڵگای کوردی، بە هەمان شێوە دەیەوێت ئەو هەڵمەتەی لە کەنداو و سعودیە دەکرێتە سەر سەید قوتب بۆ ئێرەی بهێنێت، گوایە داعشیەکان بە کتێبی سەید قوتب پەروەردەبوون.

سەید قوتب لەلایەن هەموو، یان زۆربەی هەرە زۆری زانایانی سەلەفی وەهابی سەرکۆنەکراوە و لە چاکترین حاڵدا کەسێکی نەزان و فەقیرحاڵ وجاهیلە بە ئەحکام و ئسولی ئیسلام، نە زانا بووە و نەهیچ، بەڵکو تەنها ئەدیبێك بووا هەرکەسەی ئیدانەش کرا لەلایەن سەلەفیەت بێگومان لە نێوەندی سەلەفی گاڵتەیان بە بەرهەمەکانی دێت .

هێشتا ئەگەر بڵێیت حەماسی فەلەستینی پەروەردەی کتیبەکانی سەید قوتبن، لەبەر ئیخوانیەتی حەماس هێشتا ڕێی تیدەچێت، بەڵام ئەو درندایەتیەی جەماعاتی سەلەفیەتی جیهادی بدەیتە پاڵ سەید قوتب، کە سەرەڕای هەر ناکۆکیەکمان لەگەڵ هەندیك لە بیروباوەڕی توندوتیژی، ئەوە ئیفترایە و بەڕای من دەبێت خاوەنەکەی تۆبەی لێ بکات. سەید قوتب پێی وایە سەردەمی سەرانە و جزیە و کۆیلایەتی تیپەڕیوە و کاتیان بەسەر چوە، دەبا داعشیەکان ئەگەر پەروەردەی سەید قوتبن با هێندەی بەگوێ بکەن! ئینجا ساڵح فۆزان بە توندترین شێوە ڕەخنە لە سەید قوتب دەگرێت لەسەر ئەو ڕایە جوانەی دەربارەی کۆیلایەتی و سەرانە.

ئەو وەحشە بەشەریانەیداعش و جەماعاتی سەلەفیەتی جیهادی، و سەلەفیەتی بانگەوازیش لە ژێرکاریگەری کتێبەکانی ئەحمەد بن حەنبەل و ئیبن تەیمیە و محمد بن عبد الوهاب و لە ژێر دەستی ابن باز و ابن عثیمین و الالباني

و صالح الفوزان و حماد الانصاري و عبد الله بن عبد الرحمن و هادي بن ربيع المدخلي و کەسسانی تر دەرچوون، کە هەموویان فەتوای زۆر توندیان هەیە لە دژی سەید قوتب و قەدەغەکردنی خوێندنەوەی کتێبەکانی وتاوانبارکردنی بە جۆرەها تۆمەتی سەیر وسەمەرەی دژی توحید و وحدة الوجود و گاڵتەکردن بە پیغەمبەران، ناکرێت بلێیت ئەوانە پەروەردەی "سەید قوتب"ن.

هەرچەندە ئێمە سەید قوتب یش بە دوور ناگرین لە جۆرێك لە توندڕەوی بە تایبەتی لە قۆناغی دووەمی ژیانی پاش زیندانی و ئەشکەنجەدانی، بۆیە ئەو سەید قوتبەی کە العدالة الاجتماعية في الإسلام 1948م، و معركة الإسلام والرأسمالية 1950م، و السلام العالمي والإسلام 1951 نووسی، لەو قۆناغەدا هەست بە فکرێکی میانڕە و شارستانی وکراوە دەکەیت، لە بەراوردا لەگەڵ کتێبە کانی هذا الدين، المستقبل لهذا الدين، و الإسلام ومشكلات الحضارة، و معالم في الطريق 1965 کە دوایی نووسی، هەتا سێ جار دەستکاری جوانترین کتێبی خۆی کردوە، العدالة الاجتماعية في الإسلام، کە هەرجارەی توندتری کردوە لەوەی پێشووتر.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سەید قوتب ناکرێت سەرچاوەی ئیلهامی سەلەفیەکان بوو بێت، چونکە خۆی هیچ ئاشنایەکی ئەوتۆی بە سەرچاوەکانی فیکر وئەدەبیاتی سەلەفیەت نەبووە، هەندێك لە بیرورا توندەکانیشی وەك ئەوەی لە سورەتی التوبة دەریان دەبڕێت، دەربارەی باڵادەست بوونی ئایەتەکانی شمشێر [السيف] دوور نیە هەر لە تەفسیرە ئەسەریە سەلەفیەکان بۆی پەڕیبێتەوە، چونکە زۆربەی هەرە زۆری فەقیهەکانی سەردەم وەک محمد عبدة و رشيد رضاو محمد الغزالي و محمود شلتوت وچەندینی تر پێچەوانەی ئەو ڕایەن، هەتا یەکیکی وەك شێخ رشيد رضا کە سەر بە مدرسەی سەلەفیشە!!

یانی ئەو جۆرە بیرکردنەوە شارستانیە زاڵبوو بەسەر بیری دینی لە میسر، بە پێچەوانوەش لەوبەر دەریای سوور لە سعودیە چەتەکانی محمد بن عبدالوهاب وەك داعشی ئەو سەردەمە خراپتریش خەڵکی شار و شارۆچکەکانیان دەکوشتن و ژنەکانیشیان بە ملك الیمین و جاریە دەبردن! یانی هێشتا داعش کەمێك باشترە لە محمد بن عبد الوهابی شێخی عبداللطیفی سەلەفی کە دەستیان لە ژن وکچی موسڵمانانیش نەدەپاراست، چ جای بیپارێزن لە مەسیحی و یەزیدی و دورزی و ئیسماعیلی ....هتد. سەرەڕای ئەوەش وەک ئاماژەمان پێدا، سەید قوتب بەردەوام سەرکۆنە دەکرێت و ئیدانە دەکرێت لە لایەن زانایانی سەلەف:

لە فەتوایەکدا شێخ عبد العزیز بن باز دەربارەی وەسفێکی سەید قوتب لە کتێبی "التصوير الفني في القرآن" دەربارەی حەزرەتی موسی [د.خ] کە دەڵێت:

دەربارەی ئەو ئایەتە: [**فأصبح في المدينة خائفاً يترقب**] کە سەید دەیەوێت باس لە وێناکردنی هونەری جوانی قورئان بکات و دەڵێت: (**وهو تعبير مصور لهيئة معروفة، هيئة المتفزع المتلفت المتوقع للشر في كل حركة وتلك سمة العصبيين**) "التصوير الفني "

کاتێک ئەو قسەیە بۆ شێخ عبد العزیز بن باز دەخوێندرێتەوە دەڵێت: گاڵتەکردن بە پێغەمبەران هەڵگەڕانەوەیەکە بۆخۆی! [الاستهزاء بالأنبياء ردة مستقلة] المرجع: (درس لسماحته في منزله بالرياض سنة 1413 - تسجيلات منهاج السنة بالرياض).

هەر پرسیاری لێدەکەن: ئایە نابێت خەڵک دووربخرێتەوە لەو جۆرە کتێبانە کە قسەی وای تێدایە؟

شێخ عبد العزیز بن باز لەوەڵامدا دەڵێت: پێویستە ئەو کتێبانە بدڕێنرێن! ینبغي أن تمزق.

شێخ ئەلبانی لە فەتوایەکدا دەربارەی کتێبیکی هادی المدخلي لەسەر سەید قوتب دەڵێت: ئەوەی وتووتە دەربارەی سەید قوتب -ئەگەر دەزانی مەدخەلی جەند بێ ئەدەبە بەرامبەر سەید قوتب و چەند بوختانی پێدەکات!!- ڕاست وهەقە! کە بۆ خوێنەر ئەگەر کەمێك فەرهەنگی ئیسلامی هەبێت دەردەکەویت، کە سەید قوتب شارەزا نەبوو بە ئسوڵ و فروعی ئیسلام. خوا پاداشتت داتەوە بە چاکترین شێوە ئەی براکەم [ربیع] بۆ هەڵسانت بە ئەرکی نیشاندان و ئاشکراکردنی نەفامی و لادانی لە ئیسلامدا!!"

**ابن عثمین دەربارەی سەید قوتب دەڵێت:**

ئەهلی عیلم وەك الدویش و الالباني باسی چەند سەرنجێك دەکەن لەسەر ئەو کتێبە [في ظلال القرآن] کە لەبەردەستدایە، تەواوی ئەو کتێبەم نەخوێندۆتەوە، بەڵکو تەفسیری سورەتی ئیخلاس م خوێندەوە، بەڵگەیە کە بە قەولی یەکێتی بوون، وحدة الوجود دەڵێت"!!.

کە پرسیاری لێدەکەن دەربارەی خوێندنەوەی کتێبەکانی سەید قوتب، دەڵێت: ئەوەی ئامۆژگاری بۆ خوا و پێغەمبەر و برا موسڵمانەکانی بوێت خەڵك هاندەدات بۆ خوێندنەوەی کتێبە کۆنەکان، بەڵام تەفسیری سەید قوتب کارەساتی تێدایە [ففیه طوام]، بەڵام ئاواتەخوازین خودا لێی ببەخشێت، وەك تەفسیری بۆ الاستواء و قل هو الله احد.

ابن باز يش لەبەر تەفسيری ئايەتی [**الرحمن على العرش استوى**] كە سەيد قوتب وەك چەندين موفەسيری تر دەڵێت: [**والاستواء على العرش كناية عن غاية السيطرة والاستعلاء**] ئيستوا لەسەر عەرش كينايەيە لە زاڵبوون و بەرزبوون يان باڵابوون..

دەڵێت: "**إنكار الاستواء المعروف وهو العلو على العرش وهذا باطل يدل على أنه مسكين ضائع في التفسير**" نكوڵی كردن لە ئيستواو دانيشتنی زانراو كە باڵابوونە لەسەر عەرشدا، ئەوە كارێكی پوچەڵكراوە و بەڵگەشە لەسەر ئەوەی فەقيرێكی گومبووە لە تەفسيرد، [**من شريط أقوال العلماء فيمؤلفات سيّد قطب: تسجيلات منهاج السُنة بالرياض**].

وەك دەبينين سەلەفيەت بە گشتی كەيفی بە چارەی سەيد قوتب نايەت، كەوابوو ئەوان پەروەردەی ژێر دەستی احمد بن حنبل والبربهاري و ابن تيميه و محمد بن عبدالوهاب و ابن باز و الالباني و ابن عثيمين و ربيع المدخلی و كەسانی ترن لە قوتابخانەی توندڕەوی سەلەفيزم. ڕقيشيان لەو پياوە لەبەر ئەوەی سەيد قوتب لە دراسات اسلامية، بە تێڕوانينی دووربينانەی بليمەتانەی خۆی، وەسفی حوكمی سعودی دەكات بەوەی "كە وێنەيەكی ساختە و دزێو و بێزێنراوە لە حوكمی ئيسلام" بۆيە هێرشی دەكەنە سەر.

ئەو مەدرەسەيەی توندڕەوەی هەتا وەڵامی شتە جوان و مرۆييەكانی سەيد قوتب يش دەدەنەوە، كاتێ سەيد دەڵێت بەندايەتی بە سيستمێكی جيهانی بەسەرچوو وەسف دەكات و دەڵێت بەندايەتی هيچی تر نابێت بمينێت، و دەبێت قەدەغە بكرێت كاتێ جيهان فێری سيستمێكی تری غەيری كۆيلايەتی دەبن ".

شێخ صالح بن فوزان الفوزان:ئەو قسەیە ناهەق وبەتاڵە- پەنا بەخوا - هەرچەندە زۆر لە نووسەر و بیرمەندان دەیڵێن و دەیڵێنەوە، نەك زانایان، بەڵكو بیرمەندان وەك ناویان دەنێن !!! (هذا كلام باطل - والعياذ بالله - رغم أنه يردده كثير من الكتاب والمفكرين ولا نقول العلماء، بل نقول المفكرين كما يسمونهم."

داعش و توندڕەوەكانی تر پەیڕەو لەو سەلەفانە ناودار وپیرۆزكراوانە دەكەن كە كاتێك هشامی كوڕی عبدالملك غیلانی الدمشقي كوشت، رجاء بن حيوة ی تابیعی کە سەلەفیەکان دەڵێن خەڵک بارانی بە دوعای ئەو دەباراند! نامەیەكی بۆ خەلیفە هیشام دەنووسێت و دەڵێت: ئەی ئەمیری موسڵمانان پێم گەیشتۆتەوە، دڵت شتێكی كردوە لەبەر كوشتنی غیلان و صالح، سوێندت بۆ دەخۆم میری موسڵمانان كوشتنی ئەو دوانە چاكتر و خێرترە لە كوشتنی دوو هەزار لە [سەربازە كافرەكانی] ڕۆم و تورك!! یانی هێشتا خەلیفە كەمیك مرۆڤتر بووە و هەستی بە ئازاری ویژدان كردوە بە كوشتنی ئەو دوو زانایە، كەچی كاكی تابیعی باران بارێن نایەوێت خەلیفە ویژدانیشی بهەژێت بۆ كوشتنی زانایەكی موسڵمان چونكە بیدعەچیە! بەڵكو كوشتنیان بە خێرتر دەزانیت لە دوو هەزار سەربازی كافری موحاریب!! ئەو ڕیوایەتە بە انازیەوە لە كتێبی العواصم مما في كتب سيد قطب من القواصم ی شێخی گەورەی عبداللطیف ی سەلەفی، هادي بن ربيع المدخلي دا هاتووە ل ١٠.

ئەو داعشانە كەی گرنگیان داوە بە سەید قوتب تا شوێن كەوتەی ئەو بن، ئەوان شوێن كەوتەی ئەحمەد بن حنبل ن لە كتێبە ترسناكەكەی بە ناوی: رسالة الرد على الجهمية والزنادقة، كە تیرو توانج و تۆمەتی دنیای نامێنێت ئاڕاستەی موسڵمانانی جیاواز لە مەزهەبی خۆی دەكات! كە لەسەر بنچینەیدا هەموو بزاڤتە توندڕەوەكان دامەزران. هەر لە نامیلكەیەكی تری كوڕی حەنبەل

[كتاب الصلاة] نوێژ نەكەر بەكافر دەزانێت، و دەڵێت نابێ نوێژی لەەر بكريت و لە گۆڕستانی موسڵمانان بنێژرێت!! كە بەو قسەيە بێت زياتر لە نيوەی ئومەتی ئيسلامی بە كافر بكريت و تۆبەدار بكريت، و ئەگەر نويژی نەكرد كوژريت!!

ئەو داعشانە پەروەردەی ئيبن تەيميەن كە پێی وايە كافر يانی هەر غەيرە موسڵمانێك هيچ شتێكی حەڵاليان بۆنيە هەتا بيخۆن چونكە خوا تەنها بۆ ئيماندارانی دروست كردوە تا چێژيان لێوەرگرن!! وەك دەڵێت: " بە نسبەت كافرانەوە خودا ئيزنی نەداون هيچ شتێك بخۆن و هيچ شتێكی بۆ حەڵال نەكردوون، چونكە دەفەرموێت: [يا ايها الناس كلوا مما في الارض حلالا طيبا] مەرجی داناوە لەوەی دەيخۆن حەلال بێت، كە لەلايەن خوا و پێغەمبەرەوە ڕێگای پێدرابێت، خوداش تەنها ئيزنی بە ئيمانداران بە خۆی داوە بخۆن، هيچ ئيزنی بەوان نەداوە شتێك بخۆن تا باوەڕی پێدەهێنن، بۆيە ماڵ وسامانيان موڵكێكی شەرعی خۆيان نيە، چونكە مولكی شەرعی بريتيە لە توانای بەكارهێنان و تەسەروف پێكردنی شتەكان لەوەی شەرعدانەريش [د.خ] ڕێگای پێداوە، شەرعدانەريش ڕێگای نەداون بە تەسەڕوف كردن بە ماڵ وسامانيان تەنها بە مەرجی ئيمان نەبێت" مجموع الفتاوی ٧:٣٤ نقد الفكر السلفي.

لە شوێنێكی تر دەڵێت:" هەروەها ئەگەر موسڵمانێك خۆيان و منداڵيانی دزی يان زاڵ بوو بەسەريان بە هەر ڕێگايەك، ئەوە نەفسی كافری شەڕكەر و ماڵ وسامانيان حەڵالە بۆ موسڵمانان، ئەگەر دەستيان بەسەردا گرت بە ڕێگايەكی شەرعی دەبێتە موڵكيان"!! هەمان بەش و هەمان سەرچاوە ولاپەرەی پێشوو.

نوسەری ئەو كتێبە دەڵێت: لەوانەا ئەگەر ئەو فەتوايەم ديبا بە خێرايی بەسەريدا تێپەڕيبام، بەڵام كێشەكە لەوەدايە گەنجانێک ئەمڕۆ ئەو قسانە

وەك هەقیقەتێکی سەلمێندراو باس دەکەن، یەکێك لەو گەنجە حەماسیانە [وەك داعشەکان] بەڵگەی پی هێنایەوە لەبەردەمم بۆ تەقینەوەکانی ئیسپانیا، و دەیوت ئیسپانیا دار الحرب، و خەڵکەکەی  ماڵ و خوێنیان حەڵالي، ئەوەشی لەوێ ڕوویدا ڕێپێدراو بووچونکە خەڵکەکەی موسڵمان نین، ئەگەر ئیبنتەیمیە ئەو قسانە دەرهەق کافری شەڕکەر بکات، هەرچەندە جیاوازی ناکات لە نێوان جەنگاوەر و مەدەنی، بەڵام ئیبن عثێمین کە عبداللطیف سەلەفی بە مامۆستای دووەمی خۆی دەزانێت لەپاش ربیع المدخلي، دەڵێت:

"جەنگ دژی کافران لە پێناو بەرژەوەندی یا مەسڵەحەتی ڕاجیحەیە تا بە زۆر بکرێنە موسڵمان، هەروەها شیرك و کوفریان خوێنیانی حەڵال کردوە، نەك تەنها شەڕ و دوژمنکاریان، وپییوایە کافریشەڕکەر ئەو کافرانەن کە بەڕاشکاوی جاڕی کوفری خۆیان دەدەن"!!! مجموع فتاواه ورسائله ج٧ :١٦، هەروەها ج١٠ :١٠٦٨، شرح باب الجهاد في كتابه الشرح الممتع!

وەك دەبینین سەید قوتب لە چاو باوکانی توندڕەوی سەلەفیزم کۆتری سپی و شێنەی بایە.

## جاشی داعش بە هەزاران جۆخین لە جاشی بەعس ترسناکترە

جاشەكانی بەعس هێندە زۆربوون، خەریك بوو ماڵێك نەمێنێت جاشێكی تێدا نەبێت، ئەوەش لەبەر ئەو هەموو فشارە گەورەیە ئەمنی و سیاسی و یاسایی و ئابووریەی، كە دەسەڵاتی بەعس خستبویەتە سەر خەڵك لە لایەك، لە لایەكی تر ئەو هەموو تاوگێری و ئیغرا مادیەی كە هەڵی دەڕشت بۆ كاری سیخوڕی وخیانەت، كە هەڵبەتە كەسانێكی نەفس نزمیان فریو خواردوو دەكرد.

كەوابوو جاشەكانی كۆنی بەعس، سەرەڕای قێزەونیان و خۆفرۆشیان، بەڵام ٩٠% ناتوانین بڵێین بە باوەڕەوە جاشی بەعس بوبن، ویان لە دژایەتی كورد و میللەتی خۆیان وایان كردبێت. خەڵكێكی زۆر لە ترسی چوونە سەربازی دەبوونە جاش، وەهەتا مووچەشیان وەرنەدەگرت تەنها وازیان لێ بێنن و ناسنامەیەكی لە گیرفان بێت تا حوكمەت نەیگرێت. بەشێكی تر لەبەر هەڵوێسی سەرۆك عەشیرەتەكەی بە ناچاری دەبووە جاش، هەبوو لەترسی دوژمنداری، وەهەبوو لە دژی ناحەزانی كە ببوونە جاش و تا دەستدرێژی نەكەنە سەری ئەویش دەبوە جاش! ڕێژەیەكی زۆر كەم هەبوون بە باوەڕی تەواوەوە ببوونە جاش و بەدڵ وبە گیان و بە ناموسیش خزمەتی ڕژێمی بەعسیان دەكرد.

بەڵام پاش ڕووخانی بەعس و دارمانی دەسەڵاتی عەرەبی سوونە لە عێراق، ئەمڕۆ سوونەی عەرەب لە یاریەكی ترسناكی ژیرانەی ماڵوێران ئەنجامدا، بۆ قەرەبووكردنەوە قەبارەی بچووكبوەوەیان پاش لێ داماڵینی دەسەڵاتیان، توانیان ئەو دروشمەی كە بەعس بۆی جێبەجێ نەكرا بەناوی امة عربیة واحدة، ذات رسالة خالدة، زۆر بە زیادەوەش جێبەجێی بكەن نەك تەنها لەسەر ئومەتی عەرەبی، بەڵكو لەسەر ئومەتی ئیسلامیش، ئەمڕۆ خەڵكی هەشتا وڵات زیاتر بەژدارن لە شەڕەكانی داعش و ماڵ ومناڵ و كار و ژیانی خۆیانیان

بەجێهێشتوە بۆ ئەوەی لە ڕیزی داعشدا گوایە جیهاد بكەن! كەسانێكی كوردیش كە كەم ژمارەش نین، ئەمرۆ ماڵ و وڵات و ژیانی خۆیان جێهێشتووە چوونەتە ڕیزەكانی داعش بۆ ئەوەی جیهاد بكەن هەتا لە دژی میللەتی خۆشیاندا.

بەڕای من هەر جۆرە شەڕێك لە دژی میللەتەكەت دەچێتە خانەی جاشایەتی با بە هەزار دروشمیش ڕازابێتەوە. ناكرێت لە پێناو جەماعەتێكی عەرەبی نەناسراوی گومانلێكراوی تیرۆرستی وەك داعش بەوپەڕی حەماسەتەوە بچیتە ڕیزی ئەو قەوارەیە پڕ نهێنی وغموزە! ناكرێت لەوەتی كورد وكوردستان هەیە هەر هێرشی دەكرێتە سەر، هەر خاكی كوردە تەعریب دەكرێت و تەتریك دەكرێت و تەفریس دەكرێت، كەچی تۆ بە ناوی دینی ئیسلامەوە بەگەر ئەو داعشە مەغۆلیانە بكەویت سەدان هەزار كورد دەربەدەر بكەیت وسەدان گوند بروخێنیت ، و هەزاران كەس بكوژیت لە میللەتەكەت تەنها لەبەر فریوخواردنت بە تلیاكی دینی داعشی، وهێشتا خۆشت بە جاش نەزانیت، وەك جاشەكانی بەعس خۆت پێ فورسان [سوارچاك] بێت؟! جاشە كوردەكانی داعش بۆیە ترسناكترن، چونكە جاشێكی بێ مەعاش و زۆر خۆبەخشانە و زۆر بە جۆش وخرۆشانە و زۆر بە باوەڕەوە خۆی دەفرۆشێت بەو غەوارە ونامۆیانەی داعش كە كەس نازانێت دروستكراوی چەند دەوڵەت وچەند موخابەراتن، وزۆر دڵسۆزانەش كوردیان بۆ دەكوژن! تا ئێستا لە سەدان شەڕی داعش لە دژی كورد لە كوردستانی عێراق وسوریا بەژداریان كردوە و یوتیوبەكانیان هێندە زۆرن لە ژمار نایەن! چەندین داعشی كورد لە كۆبانێ سەگ تۆپ بووە.

ئەو ڕۆژە لە سایتێكی یەزیدی هەواڵێكم خوێندەوە كە داعشە كوردەكان جلی شەڕڤانانی یەپەگە یان پۆشیبوو بۆ ئەوەی زەفەر بە گروپێك لە چەكدارانی یەزیدی ببەن وبیانكوژن! یانی بەس نییە ژن وكچ وخوشک ومناڵیان هەمووی بە

کۆیلە کراون وبەس نییە ئافرەتی یەزیدی کورد وەك جاریە ڕۆژانە کڕین وفرۆشتنی پێدەکرێت، هێشتا دڵی داعشیەکان خۆش نەبووە وهەدای نەداوە، ئەو داعشە خۆفرۆشانەی کوردیش بێ ئەوەی یەك زەرە ویژدان و مرۆییان هەبێت، ووەك کوردێك هەست بەو کارەساتانە بکەن کە بەسەر ئەو هاونەتەوەیانەیان هاتوە، هەتا ئەگەر هاونەتەوەش نەبن لای هەردوولا، بەڵام هاو چارەنووسن، چۆن دەتوانیت تۆ بچیت بە فڕوفێڵ کەس وکاری کۆیلەکانیشیان بۆ بکوژیت؟! تۆ دیلی چۆن دیل دەکوژیت؟! وەك پەشێوی مەزن دەفەرموێت.

گوێبگرە بۆ داعشە کوردەکان کە چۆن داخ لە دڵانە دژی وڵاتەکەیان و میللەتەکەیان قسە دەکەن و چۆن ناوی پێشمەرگە دەهێنن بە کافر ومورتەد، ئەو کاتە دەزانیت ئەو جاشە داعشیانە چەندە ترسناکترن لە جاشە کۆنەکانی صدام وبەعس، کە قەت لەناو کۆمەڵدا شانازیان بە جاشایەتیەکەیان نەدەکرد وخەڵك هەبوو ڕەزیل وڕیسوایان دەکردن، وئەوانیش سەریان شۆڕ دەکرد.

جاشە داعشیەکان بۆیە ترسناکترن، چونکە بەوپەڕی ڕێزەوە لەناو مزگەوتەکانماندان و بەشێکی زۆری مینبەرەکانمانیان داگیرکردوە، لە زانکۆکان و قوتابخانەکانمان وانە دەڵێنەوە و وەردەگرن، ومووچەی ئەو وڵاتە وەردەگرن و ئەو وڵاتە ڕێگەی کاری سیاسی ئازادی پیداوە، بەڵکو دەنگی سەدان هەزار هاوڵاتیان زەوتکردوە وبوونەتە ئەندام پەرلەمانیش، کەچی هێشتا دڵیان نایەت قسەیەك بە داعشیەت بڵێن! شانازیش بە داعشبوونیانەوە دەکەن. جاشە کۆنەکانی بەعس بە هەزار ئاو شۆردراونەتەوە لە چاو جاشە نوێکانی داعش.

کوشتنی مەلا صلاح جمال گە بەدەستی میلیشیاتی بەدر کێشەیەکی گەورەیە لەوانەیە کورد راکێشێت بۆ شەڕێکی تایفی ڕەنگ! بەر لە هەموو شتێك بە توندترین شێوە ئەو کارە تیرۆرستە مەحکوم دەکەین، کە هەموو بەڵگەکان کۆکن لەسەر ئەوەی بە دەستی ئەو داعشیە شیعیانەی بەدر و حەشدی شەعبی ئەنجامدراوە، دەبێت یەکێتی بزانێت گەورە باجەکەی ئەو شەڕە لە کاتی هەڵگیرسانیدا ئەوان دەیدەن بە پلە یەك. پێویستە یەکێتی بە زووترین کات وەڵامی داخوازیەکانی خەڵك بداتەوە، نەهێڵێت ئەو میلیشیاتە بۆگەنە فەوزەویە هیچیتر پێی گڵاویان بخەنە ناو هیچ شار ودێیەکی کورد، بابەس بیت تەنازول بۆ ئێران و چڵکاوخۆرانی ئێران لە عێڕاقدا.

ئێوارەی ئەمڕۆ لە کاتی خۆپیشاندانی دانیشتوانی شاری دووزخورماتوو دژی کوشتنی مامۆستایە ئاینیەکە، هەستم بەوە نەدەکرد، ئەو شارە شارێکی کوردە و لەسەر کێشەیەکی کوردی ئەو هەموو خەڵکەی کورد وا وروژاون! ئەو مەلایە کوژراوە لەوە دەچێت مەلایەکی سەلەفی سونی بێت، کە ئەندامیشە لە وەقفی سوونی، وڕەوتی خۆ پیشاندانەکەش زیاتر وەك سایتێکی سوونی عێڕاقی عەرەبی وەسفی دەکات بە سەرەتای ڕاپەڕینی خەڵکی ئەنبار دەچێت! ئەو هەموو چاکەت ڕەشانەی لەو خۆپیشاندانە بوون،کە دەتگووت ئیعلانی داعشیەتی خۆیان دەکرد بە ناڕاستەوخۆ، و ئەو چەك هەڵگرتن و دەمامککردنی دەمووچاویان لە شێوازی خەڵکی عەرەبی سوونی دەچوون، وەك لە کورد، و هەروەها گوتنەوەی هێما ودروشمی دینی زیاتر کوردی وەك ئەو سوونە عەرەبە لاوازانەی بن دەستی میلیشیاتی شیعە نیشان دەدات! کورد وپێشمەرگە لەبەر نامەزهەبیەتی ئاڕاستەیان، وەك هێزێکی گەورە و سەردەستی عێڕاق و بەهێزتر لە سوپای

فشۆڵی نیشتیمانی دەردەكەوێت، و جیهان هەمووی ستایشی دەكەن، پێویست ناكات كورد خۆی بخاتە هەڵوێستی لاوز.

كورد نابێت ڕابكێشرێتە ناو ئەو كێشە تایفیە، ودەبێت پێگەی پێشمەرگە لەو شارە بەهێزبكرێت و هێزە كوردیەكان بەرگری لە هەموو كوردێک بكەن بەبێ ڕەچاوكردنی ئینتیمای دینی یان ئایدیۆلۆژی. ئەوە مانای ئەوەش نیە ڕێگە بە چەوساندنەوەی مەزهەبی بدەن لەو ناوچانە، ئەگەر ئەو جۆرە كێشانە ڕێگای پێ بدرێت تەشەنە بكات، گەنجێكی زۆری كوردی ئەو ناوچانە لەبەر هۆكاری ناوەخۆ لە پفدانی ڕەوتە سەلەفیەكان كە زۆر ئامادە وتەیارن بۆ شەڕی شیعە وسونە، و كاردانەوەیان بۆ ئیستیفزازی میلیشیات و هێزە شیعیەكان، دوور نیە پەنا بۆ داعش ببەن و ببن بە كێشە وسەرئێشە بۆ كوردیش.

چونكە ئیستیفزازات و قەسوەت وبێ ڕەوشتی میلیشیا شیعیەكان هیچ سنورێك نازانێت، و ئەوان هۆی سەرەكی بوون لە بەداعش بوونی ئەو ڕێژەیە گەورەیەی سوونەی عەرەب، چونكە خەڵكانێكی بەنجكراوان بە تلیاكی مەزهەبی و فەتوای تایفی گوێ بە هیچ نادەن لە پێناو ڕازیكردنی خوای مەزهەبیان.

## ئامۆژگاری نامەیەك بۆ مامۆستا كرێكار لە عەبدێكی فەقیرو زەئیلەوە

پێشەکی پیرۆزبایی ئازاد بوونت لێدەکەم، بەڕاستی ئەوەی جارێك تۆی دیبێت بەر لە تێوەگلانت بەو تەفکیرە سەلەفیە، قوتبیە، قاعیدیە، هەرگیز چاوەڕوانی ئەو سەرەنجامەتی لێ نەدەکرد! کەسێکی ڕۆشنبیری، خوێنەواری، موتەلیعی، شاعیری، کوردپەروەری بێ فەرق وجیاوازی نێوان شارەکان، هەست ناسکی، ڕێزگر لە ئافرەت، لە هەمووی گرنگتر مەجلیس خۆشی، نوکتەچی، وەك تۆ ئەرز وئاسمان دوورە لە ڕادیتنی تەبەنا کردنی ئەو جیهان بینیە ئیسلامیە عەرەبیەی کە زادەی عەقڵیەتێکی بەدەوی، سەحرانشینی، تەسکی، فیقهی و نەرێتە کۆنەکانی عەرەبە، دژە بە هەموو بەهاکانی مرۆڤایەتی، پێشی وایە لە هەموو مرۆڤایەتی پاك وبی گەردترە.

چونکە تۆ سەرسامی بە سەید قوتب، کە هەتا منداڵەکانت بە ناوی خۆیی و بەرهەمەکانی کردوە، و کردوتن بە دیلی سەرسامی خۆت بەو بیرمەندە ئیسلامیە، کە من پێموا بێت کارێکی زیادەڕەویت کردوە، وڕەچاوی هەستی منداڵەکانیشت نەکردوە لەوەدا، چونکە حەدیس لەسەر ئەوەش هەیە کە ناوی چاك لە منداڵەکانتان بنێن، وچاکترین ناویش بەپێی حەدیسی "**عبدالله و عبدالرحمن**"ە، **عَنْ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ** : **(إِنَّ أَحَبَّ أَسْمَائِكُمْ إِلَى اللَّهِ عَبْدُ اللَّهِ ، وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ)** رواه مسلم.

عومەری کوڕی خەتاب یش کاتێ گەنجێك پرسیار لێکرد هەقی منداڵ لەسەر باوك ودایکی چیە؟ فەرمووی: دایکێکی باشی بۆ هەڵبژێرێت، و ناوێکی باشی لێ بنێت، وفێری قورئانیشی بکات. [أن ينتقى أمه، ويحسن اسمه، ويعلمه الكتاب].

سەيد قوتب بەرلەوەی بكەوێتە ژێر كاريگەری ئەبو ئەعلای مەودودی و ئەدەبياتی ئيخوان بە گشتی، يەكێك بوو لە گەورەترين ڕەخنەگری ئەدەبی لە ميسر، سەرەڕای سروشتی دينداری لەسەر چەندين ڕۆمانی نەجيب مەحفوز نووسيويەتی، كە دووان لەوانە [اولاد حارتنا ] و [خان الخليلی] هەرای زۆری نايەوە گوايە پڕن لە كوفر، سەيد قوتب ڕۆمانی خان خەليلی "خان الخليلی" نەجيب مەحفوزی لە نووسينەكەيدا زۆر ستايش كردوە هەرچەندە لەو ڕۆمانە لەسەر زمانی كەسايەتيەكان قسەی زۆر ترسناك و دژی دينی تێدا كراوە، بۆ نمونە لەسەر زمانی كەسايەتی احمد راشد كە پارێزەرە هاتووە: "هەروەك چۆن دينەكان ڕزگاريان كردين لە وەسەنيەت، پێويستە زانست ڕزگارمان بكات لە دينەكان".

"**فكما انقذتنا الديانات من الوپنيه ينبغی أن ينقذنا العلم من الديانات** " هەروەها دەڵێت: زانايانی هاوچەرخ دەزانن ئەتۆم چی تێدايە، و لە دوای سيستمی خۆری ئێمە مليۆنەها سيستمی خۆری تر هەيە، كەوابوو كوا خوا لە كوێيە؟! " العلماو المعاصرين يعلمون بما فی الذره من عناصر، وبما وراو عالمنا الشمسی من ملايين العوالم، فأين الله ؟"، هەر ئەوەش نا دەربارەی ڕۆمانی [اولاد حارتنا ] كە ميانڕەوەكانيش نەجيب مەحفوزيان تەكفير كرد لە سەری، وخەريك بوو بە كوشتی بدەن بە دەستی نەزانێك، دەڵێت: ئەو ڕۆمانە ئەفسانەيەكی ئەدەبييە موستەهەقی ئەوەيە قوتابی قوتابخانەكان بيخوێنن " !إنها أسگوره أدبيه تستحق انها تدرس لتلاميذ المدارس" سەيد قوتب سەرەرای دينداريەكی سروشتی تێدا بوو، بەڵام تا نەچووە ناو ئيخوان و نەكەوتە ژێر كاريگەری چوار زاراوەكەی [المصطلحات الاربعة] ی ابو الاعلی المودودی ، ئەو بيروڕايە توندانەی تەبەنا نەكرد. بڵێی سەيد قوتب ژيان بواری پێدابايە، پاش

قۆناغی نووسینی معالم فی الگریق جارێکی تر خان الخلیلی بخوێندبایەوه، نەجیب مەحفوزی تەکفیر بکردبا؟! چونکە نەجیب مەحفوز پاش ئەوەی سەید قوتب بوو بە ئیخوان و زیندانی کرا، سەردانی سەید قوتبی کردوه وەك لە کتێبی [المرایا [باسی دەکات و پێی دەڵێت:

-'جێگای داخە کە تۆ وازت لە ڕەخنەی ئەدەبی هێنا.
بە دەم پێکەنینەوه گووتی:
-ئەی لەو ئاواتخوازیە جاهیلیانە.

هەتا رەخنەگرێکی وا گەورەی ئەدەبی لە ماوەیەکی وا کورتدا وا بگۆڕێت! ئەوه نیشانەی سروشتێکی توندڕەوانەی هەڵەشەییانەیە. وسەید قوتب سروشتی وا حەدی وتوندڕەو بووه، لە وتارێکی تری تایبەتدا بە درێژی باسی ئەو سروشتە توندڕەوەی دەکەم لە هەر دەورانێکدا.

لە دواییدا پاش نزیکەی شەست ساڵ یەکێکی پەروەردەکراو لەسەر بیروڕا توندەکانی سەید قوتب چەقویەک لە ملی نەجیب مەحفوز دەدات لەسەر ئەو اولاد حارتنا، کە سەید لە بەراییدا ستایشی کردبوو.

من گومانم لەوه نیە کە سەید قوتب ئەگەر مەرگ بواری دابا دوور نەبوو بەو عەقڵیەتە بلیمەتەی، بەو مەوسوعیەتەی، پاش دیتنی کارە درندەکان و کارەساتاویەکانی گرووپە جیهادیە سەلەفیە قوتبیەکان، حاشای لەو بیوبۆچانانە دەکرد وەك شێخ محمد الغزالی کە بە پێچەوانەی سەید قوتب بوو، لە گەنجی هێرشی کردە سەر ڕۆمانی اولاد حارتنا، کە چووە ناو تەمەن و ئەزموون ڕۆژ بەرۆژ میانڕەوتر دەبوو، کە هێرش کرایە سەر نەجیب مەحفوز لەسەر ئەو ڕۆمانەی کای خۆی هێرشی کردبوە سەر وبە کوفری دانا بوو، ئەوجارەیان شێخ

محمد الغزالی بەخۆی سەردانی نەجیب مەحفوزی کرد لە نەخۆشخانە، وبە توندترین شێوە هێرشی کردە سەر شێخ عبدالحمید کشک، کە جەماوەریترین شێخی میسر بوو، سەبارەت بە نووسینی کە کتێبێکی دنەدەری تەحریزی لە دژی نەجیب مەحفوز بە ناوی " کلمتی فی الرد علی نجیب محفوظ " هەموو شیخ و پیاوە دینیەکانی کە دژی نەجیب مەحفوز قسەیان کردبوو وبە جاهیل و نەخۆش ناوی بردن.

مامۆستا کرێکار تۆ ئەگەر لە خۆرهەڵات بایت، لە پاکستان یان ئەفغانستان یان کوردستانیش، تا ئێستا بەو بیرکردنەوەوە شتێکت بەسەر هاتبوو، نەك لەبەر ئەوەی دنیا هەمووی دژی ئیسلامە، بەڵکو لەبەرئەوەی ئەو جیهانبینیە تایبەتیەی ئێوە بۆ ئیسلام بواری هاوژیانی لەگەڵ کەس ناهێڵێتەوە، نە کافران و نە موسڵمانانی دەرەوەی بازنەی خۆتان! تۆ زۆر لەوە عاقڵتری هێشتا هەر لە قۆناغی بیری پڕ حەماسەتی گەنجانەی سەید قوتب چەق بەستوو بیت، کە گومانم نییە سەید قوتب تەمەن بواری دابا لەو قۆناغە میسالیە پڕ لە خەونی ئاڵا و واڵا نە دەمایەوە پاش دیتنی ئەو دەرەنجامە کرەسات ئامێزانەی جیهادیەکان بە ناوی سەلەفی ساڵح و سەید قوتب.

سەید قوتب لە زۆربەی کتێبەکانی بیرۆکەیەک دەڵێت ودەڵێتەوە و جەختی لەسەر دەکاتەوە "کە ئیمەی موسڵمان هیچ پەیامێکی زانستمان پێ نییە پێشکەشی جیهانی بکەین، چونکە لەو بوارەدا پێشمان کەوتوون و هەر واش بە بە جێماوی دەمێنینەوە هەرچەندە هەوڵمان دا، ، بەڵام پەیامی ئیسلام و یەکتا پەرستی خوا و بەها بەرزەکانی ئیسلامان هەیە پێشکەشی کەین"

منیش لەگەڵ نیوەی یەکەمی قسەکەی سەید قوتب م کە " هیچ پەیامێکی زانستمان پێ نییە پێشکەشی جیهانی بکەین" بەڵام کارەسات لەوەدایە بەشی دووەمی قسەکەشی کە بریتیە لە پێشکەش کردنی " پەیامی ئیسلام و یەکتا پەرستی خوا و بەها بەرزەکانی ئیسلام" نەهاتە دی، وبەڵکو ئەو پەیامە گۆڕا بۆ سەرچاوەی نیگەرانی و شوهرەت بەدی موسڵمان، وماڵوێرانی، ومرۆڤ کوژی و دڕندایەتی ناوەوەی جیهانی ئیسلام و دەرەوەش.

- ئیسلامێکیان پێشکەش خەڵک کرد کە پڕاوپڕە لە سەربڕینی وەحشیانەی کە بۆ ئاژەڵێش گوناهە بەو شێوەیە بە کۆمەڵ خەڵك بە نۆرە سەربڕیت.
- ئیسلامێك کە هەموو دنیا باسی پیرۆزکردنی ئازادیەکان دەکات، کەچی ئەو ئاوات دەخوازێت بە گەڕانەوەی سەردەمی کۆیلایەتی و سبایا و جاریەچیەتی.
- ئیسلامێك خەڵک پاش دیتنی هەزار ڕەحمەت بۆ فاشیزم و گۆڕی مۆسۆلینی دەنێرێت.
- ئیسلامێك هەر خەریکی تەکفیر وتەفسیق و ڕەجمکردن و کوشتن و دەستبڕینی خەڵکە.

قەت بە عەقڵم داناچێت کەسێك لە بلیمەتی و ڕۆشنبیری و هەست ناسکی سەید قوتب دابێت، ئەگەر بژیا با ئەو کارەساتانەی بدیبا ڕازیبا پێی، گوومانم نییە کە سەید قوتب لە شێخ محمد الغزالی حەکیمتر دەبوو. قەت بە عەقڵم داناچێت کەسێکی لە بلیمەتی و ڕۆشنبیری و هەست ناسکی کرێکار بێت، هەر بەردەوام بیت لەسەر بیرکردنەوە بە هەمان شێوەی بیرکردنەوەی سەید قوتب لە قۆناغی لاوێتی وحەماسەت وپاش ئەشکەنجە دا!

هیچیتر هەڵمەخەڵەتێ بە دەست لە پشتدانی میدیای جەزیرە وعەرەبی کە پێیان خۆشە لەسەر سکرینەکانیان درووود بۆ شێخ ئوسامە بن لادن و زەواهیری و خەلیفە بەغدادی بنێریت. خەڵکێکی زۆر تەمەنای مەرگ و نارەحەتیت دەکەن، لەبەر کار وقسەکانت لە ڕابردوودا، کە دەتوت بە تەور لە ملیان دەن ئەگەر کوفرێکیان کردا! کەسێکی زۆریش خۆشیان دەوێیت لەو وێنەیەی ئێستادا، کەسێکی جیهادی، سەلەفی، قوتبی، عروبی قاعیدی.

من لەگڵ هیچ لەو دوو گروپە نیم هیوادارم وەك جەماعەی ئیسلامی میسر موراجەعاتێك بکەیتەوە بەخۆت داچیتەوە، ئەو ڕیش وهەیئەتەت چاك کەیتەوە، نەفرەت لەو هەموو تاوانە بکە کە بە ناوی ئیسلام دەکرێت لە جیهان و کوردستان بەتایبەتی کە لەبەردەم درندەترین هێرشی تیرۆرستی دایە، دوور لە پاکانەکانی عەقڵیەتی فاشیستانەی عەرەبی ئیسلامی، تۆ دەبوایە تیۆرستێکی [منظر [ڕیفۆرمخوازی ئیسلام بایت لە ئاستی غەنووشی و د. عدنان ئیبراهیم، نەك جیهان بە تیرۆرستێکی شوێن کەوتەی فاشیسترین نوسخەی ئیسلامی سەلەفی جیهادیت ناوزەد بکات.

من لە ڕیز و تەقدیرم بۆت ئەو چەند وشەیەم بۆ نووسیت، متمانەم بە عەقڵ و ئیحساسی مرۆڤانەت هەیە، هیوادارم ئەو قۆناغە تێپەڕێنیت، بە بیرێکی نوێی و بەخۆداچوونەوەیەکی واقیعیانە بگەڕێیتەوە گۆڕەپانی فیکر وسیاسەت، ئەگەر نا هەر نەگەڕێیتەوە باشترە، ئەو چەند کاتەی ماوتە بۆ ئاسوودەیی خێزانە بەرێزەکەتانی تایبەت کە.

## سەرنجەکانم لەسەر چاوپێکەوتنە کەی مامۆستا کرێکار لەگەڵ جەزیرە

## سەرنجی یەکەم

پاش دیتنی چاوپێکەوتنەکەی کرێکار لە گەڵ الجزیرە بە تەواوی بێ ئومێد بووم لە هیچ جۆرە بە خۆدا چوونەوەیەکی، من لە وتارەکەم بە ناونیشانی : ئامۆژگاری نامەیەك بۆ مامۆستا کرێکار... زۆر بە دڵسۆزیەوە هەوڵی پێگووتنی جەند ئامۆژگاریەکم دا بە مامۆستا کرێکار، کە پێمواپێت کەم لەوانەی دەیناسن بەو ڕاشکاوییە پێی بڵێن. یەکێ لەو خاڵە گرنگانەی کە لە وتارە ئامۆژگاری نامەکەم، کە بەر لە چەند ڕۆژێك بڵاوم کردەوە هاتببوو: " هیچیتر هەڵمەخەڵەتێ بە دەست لە پشتدانی میدیای جەزیرە ومیدیا عەرەبیەکان، کە پێیان خۆشە لەسەر سکرینەکانیان درووود بۆ شێخ ئوسامە بن لادن و زەواهیری و خەلیفە بەغدادی بنێریت!" وەک دەبینن بە تایبەتی باسی جزیرەم کردبوو تا فریویان نەخوات، بەڵام ئەو پیاوە کێشەی دەروونی هەیە لەگەڵ کامێرا و مینبەر و مایك، کە کەوتە ڕوو بە ڕوو لەگەڵ هەر کامێکیان، هاوسەنگی تێك دەچێت، ئەو قسەیە دەکات کە شوێن کەوتوانی پێیان خۆش بێت، لەو چاوپێکەوتنە وتاری ئەو ئاڕاستەی جیهادیە توندڕەوەکانی دەوڵەتی داعشی خەلافەت کراوە، زۆر بە ڕاشکاوی بەرگری و هاوسۆزی و ڕەوایەتی پێدان نیشان دەدات، بەو تیرۆرستانەی دەوڵەتی داعشی .ئەو زمانەی لەو چاوپێکەوتنە بەکاری هێنا تا سەرئێسقان هەڤدژ و یاریکردن لەسەر دوو حەبلی و چەواشەکارە. سەرەتا بەرگری لە خۆی دەکات کە هیچی لەسەر نییە و وازی لێ ناهێنن و کەیسی مولوفەقی بۆ دروست دەکەن بۆ ١٣ ساڵی ڕەبەق، وگوایە بەس لەو ساڵی دوایی ٥ ملیۆن دۆلاریان لە کەیسی کریکار خەرج کردوە بێ سوود! دەڵێت بۆیە یەخەی منیان گرتووە، چونکە من کوردم وکەس نیە بەرگریم لێ بکات، و دەوڵەتێك لە پشتمەوە نییە! ئەو ڕەخنەیەی جەنابت دەیگری لە دەوڵەتی نەرویج لە سەرێکیتر ستایشە! تەنها بۆ ١٣ مانگ ٥ ملیۆن دۆلار سەرف کەن

لەسەر دۆزینەوەی بەڵگەی ڕاست ودروستی تاوانی تۆ، بەو وەزعە ئابووریە خراپەی سەرتاسەری ئەوروپا، ئەوە بەڵگەی هەق دۆستی و ڕەوشت بەرزی و یاسادۆستی و مرۆڤایەتی خۆیانە. خوا دەزانێت لەوەتی بە تۆوە خەریکن چەند سەد ملیۆنیان سەرف کردبێت. ئەگەر تۆ گیراوی ئەو دەوڵەتە خەلافەتەی کە تۆ بە ئەوپەڕی ئاوات و خواست وخەونی خۆت و موسڵمانانی دەبینیت، بایت، پێنج دۆلاریشیان لێ سەرف ناکردی بۆ ئەوەی بە گوللی بدەن بۆ کوشتنت، بە چەقۆ سەریان دەبڕیت وتەواو! نە دادگایی ونە سەرف کردنی پێنج ملیۆن دۆلار لە وەرگێڕانی کاسێتەکانی تۆیان سەرف ناکرد. تۆ بەو هەموو ڕابردووە جیهادیەتەوە گیراویت و وتارت هیچ ڕۆژێك جیانەکردۆتەوە لە وتاری قاعیدە وئەنساری ئیسلام و هەرە توندرەوەکانی دنیای ئیسلام، هێشتا گلەیی لە بەختی خۆشت وعەدالەتی نەرویج یش دەکەیت، ئەی بۆ ئامۆژگاریەکی دەوڵەتی داعشی مونتەهای خەونی موسڵمانان ناکەیت کە بۆچی کارمەندی ڕێکخراوە خێرخوازەکان بەبێ گوناە سەردەبڕێت و داوای ملیۆنەها دۆلار دەکەن لەبری خوێنیان؟! دواترینیان ئەو دوو ژاپۆنیە بێ بەختە بوون کە وەك مریشك سەریان بڕین.

## سەرنجی دووەم

مامۆستا کرێکار تەکنیکێکی هەیە لە زۆر وتار و چاوپێکەوتن و کۆڕدا بەکاری دەهێنێت، ئەویش ستایشی خۆ کردنە کە ئەوە هەندێکیانە: من ٦٠٠ کاسێتی دەرسی دینیم هەیە و ١٠٠ یان بە تەنها بۆ بەلاغەتی قورئان تەرخان کراوە !باسکردنی بابەتی قەبە بەبێ بۆنە وەک تیۆری ابراهیم ماسلو و پتویستیە فیزیکیەکان و مەعنەویەکانی مرۆڤ.. یان بە دەوی خۆی دەڵێت من کەسێکی ڕۆشنبیری وموفەکیریکی موسڵمانم! ستایشی خۆی دەکات کە لەوەتی لە

نەرویجه ئەزیەتی هاوسێكانیشی نەداوه! بێگومان له ئەوروپا كەس ناتوانێت ئەزیەتی هاوسێی بدات، هەتا ئەگەر بشیەوێت! چونكه هەر زوو بە زوو دەریدەكەن له ماڵەكەی. لەوانەیه مامۆستا كرێكار ماڵی له موسڵ با، لەبەرچاوی داوای جزیه له هاوسێ مەسیحیەكانی كرابا بە فەرمان و تەكلیفی دەوڵەتی داعشی. له هەمووی سەیرترئەو پیاوه زۆر بە سەرسامیەوه ستایشی كۆمەڵگای ئەوروپی نەرویجی دەكات، كه كۆمەڵگایەكی " كراوه و ڕۆشنبیر و هێمنه. باشه برا كه تۆ ستایشی ئەو كۆمەڵگایه دەكەیت بەو سیفەتانەوە، بۆچی هەموو ژیانت و كاتت و ئاسوودەت و ماڵ ومنداڵت خستۆته خەونی دەوڵەتێكی فاشستی تیۆكراتی وەک دەوڵەتی خەلافەتی داعشی؟! یان كرانەوه و رۆشنبیری و هێمنی بەس شایەنی نەرویجیەكان و ئەوروپیەكانه؟! ئەگەر كرانەوه و رۆشنبیری و هێمنی ئەو كۆمەڵگایه نەبا، ئەوانیش بە گیانی دینی خاچپەرستی كۆن مامەڵەیان كردبایت،وەک چۆن جیهادیه سەلەفیەكان بە گیانه دینیه كۆنه مامەڵەی خەڵک دەكەن، دەمێك بوو سەریان پەل دابوویت و ماڵ ومنداڵیان بەدبەخت كردبوویت. ستایشی دوو مولحید دەكەیت كه یارمەتیت دەدەن له سەرەتای كێشەكانتەوه لەگەل دەوڵەتی نەرویجدا، ئەی بۆ دەوڵەتی خیلافەی ئاوات وخەونی تۆ تا بە مولحید رادەگات، هەزاران موسڵمان دەكوژێت؟! توخواكەی شەرم لەو ئیمانه ناكەیت كه بە قەدد ئەو ئیلحادەی كه شەو ڕۆژ تۆ و هاوبۆجوونەكانت نەفرەتی لیدەكەن ئینسان و بەسۆز و ڕەحم و بە مروەت نەبێت؟! ئەگەر ئەو دوو مولحیده له دەوڵەته خەلافەتیه خەون و خواستی موسڵمانان با چیان لێدەكردن؟ دوو ئیمان داری وەک تۆ بەرگریان لێدەكردن؟ !ئەوه چ ئیزدیواجیەتێكه ستایشی كرانەوه و رۆشنبیری و هێمنی كۆمەڵگای ئەوروپی بكەیت كەچی بانگەوازی بكەیت بۆ دەوڵەتی تەوحید وجهادی داعشی له جیهانی ئیسلامیدا.

## سـەرنجی سێیەم

دەڵێیت لە پاكستان زۆر مورتاح بوویت، و مووچەت پێنج بەقەد دكتۆرێكی پزیشكێكی پاكستانی بوو، كەچی لە نەرویج كەس ناڵێت كەرت بە چەند !هەر لە وەزعی پاكستان بروانیت، كە برادەرانێكی سەردەمی جیهادی ناموبارەكی ئەفغانی، كە دەرهاوێشتەی هەقیقی یەك دنیا تیرۆرست بوو، ناوی دەنێن بە پیسستان، و بەراوردی بكە بە وەزعی نەرویج، دەزانیت بۆ دەبێت كەسێكی هەموو كارەكەی وتنەوەی زانستی قال و حدپنا و وتی وتی بێت، پێنج بە قەد پزیشكێك مووچە وەرگرێت! بێگوومان لە جەهلستان جەهل برەوی زۆرە، لە وڵاتی زانست و ژیاریشدا تەنها زانستی سوودمەند بە مرۆڤەكان برەوی هەیە، هەر بۆیەش ئەو بەهەشتەیان لەسەر دنیا بۆخۆیان دروست كردوە، ئێمەش دە بە قەد ئەوان سەروەت وسامانمان هەیە، كەچی دۆزەخێكمان بۆ خۆمان وبۆ خەڵك دروست كردوە بە زیندووكردنەوەی تەقالیدی عەبس وزوبیان جاهیلی بە ناوی ئیسلامدا. دەڵێیت قەومیەكان وسۆشیالیستەكان و لیبرالیەكان و سێكیولارەكان فەشەل ونوشستیان هێنا لە گەڕاندنەوەمان بۆ مرۆڤ بوون وبەشەریەتی خۆمان، ئاواتەخوازی ئەوەی ئەوانە لێی سەرنەكەوتن، دەوڵەتی خەلیفەی بەغدادی بەعسی ڕەگ مرۆڤ بوونمان بۆ بهێنێتەوە؟! لەگەڵ پەیدابوونی ئەوانە مرۆڤ شەرم لە خۆی دەكات كە كەسانێكی وا دڕندە و بە سووك سەیركەری مرۆڤ سەر بە كیشوەرەكەی ئەو بن! شكۆی مرۆڤ بە سەربڕینی و سوتاندنی وبەردباران كردنی ودەستبرینی دێتەوە؟! بە زیندووكردنەوەی هەموو ڕیوایاتە قێزەونەكانی بەناو سەلەفی ساڵح شكۆی مرۆڤ دەگەڕێتەوە؟! ڕاستە ئەوانەی باستكردن فەشەلیان هێنا لە پاراستنی كەرامەتی مرۆڤ و دەوڵەت قەمعی و داپلۆسێنەر بوون، بەڵام دە ئەوەندەی تریش خراپ

بن و نا مرۆڤ بن، ناگەن بە خراپی و نا مرۆڤی یەك ڕۆژی قاعیدە و داعش و نوسڕە و هەموو دۆستەكانی ترت.

## سەرنجی چوارەم

من وام رادەدیت لێت، پاش ئازاد بوونت، هەر هیچ نەبا قسەیەكت دژی ئەو شەڕفرۆشتنەی داعش بە كورد كردبا، نەك وەك عەرەبێكی رەگەزپەرست هێشتا كوردت تاوانبار كردبا بە شەڕ فرۆشتن بە داعش بە دنەدانی خۆرئاوا و ئێران! هەموو جاودێریک دەزانیت كە كورد كاتێ داعشی خوێڕی شەڕی مالیكی شیعەی دەكرد، پێشمەرگە كوردەكان لەسەر هێڵی سنور چاك وچۆنی، و قسەیان لەگەڵ چەكدارانی داعش دەكرد. تا ئەو هێزەی كە هەڵیان دەسورێنێت فەرمانی پێكردن وەك بەراز ملیان بەرەو كوردستان وەسوڕێنن، هەر بە تەواوی شیعەیان لە بیر كرد، كە دایك و خوشكیانی نەهێشتۆتەوە بەبێ دەستدرێژی كردنە سەر! ئەو عەرەبە سوونیە شۆڤێنستانە لە بیریان چوو تا ئێستاش زیاتر لە ملیۆنیكیان لە كوردستان داڵدە دراون، و كورد هەردەم پەناگە بووە بۆ سەركردەو وبنكردەیان. سەرەڕای ئەو هەموو راستیەش قسەی عەرەبە شۆڤێنستەكان دووبارە دەكەیتەوە؟! گوایە ئەوە شەڕی كورد نیە تا بیكات؟! بە داعش بڵێ ئەوە شەڕی ئیوە نیە، بە ئاغاكانتان بڵێن بۆچی دەبێت شەڕی میللەتێك بكەین كە بەوپەڕی سینگفراوانی وتەساموحی ساویلكانە باوەشیان بۆمان كردۆتەوە، لە بازارەكانیش لەبەر خاتری ئێمە گۆرانی عەرەبی لێ دەدەن؟! لە جیاتی شەڕ بكەن لە دژی ئەوانەی دەیانكوژن و دەیانبڕن و دەستدرێژی دەكەنە سەر نامووسی ژن و بەڵكو پیاوەكانیشیان، دێن شەڕی نەتەوەیەكی زامداری ئەنفال وهەڵەبجە و شەڕەكانیتری عەرەبی سوونەی شۆڤێنی دەكەن؟! دیارە تۆ مادام دژی یەكێتی و پارتی ت، پێت ئاساییە هەموو

کوردستان بکەوێتە ژێر دەستی داعش، تا کچانی کورد وەك یەزیدیەکان بکەنە کەنیزەکی خۆیان؟! ئەوەیە شانازی کردنت بە باپیرەت سەڵاحەدینی ئەیوبی، کە لە میهرەبانیدا هەموو مەسیحیەکانی سەردەمی خاچ پەرستیشی سەرسام کردبوو بە خۆی؟! لە جیاتی ئیدانەی ئەو هەموو کوشتارەی دەوڵەتی تیرۆرستی خەلافەت بکەیت لە دژی کورد، لە جیاتی ئامۆژگاری گەنجە فریوخواردەکانی کورد بکەیت شەڕ دژی میللەتە زامدارەکەیان نەکەن ونەبنە جاشی داعش، دەچیت ستایشی دەوڵەتی خەلافەت دەکەیت کە بەڕای تۆ تەئسیلی شەرعی بۆ کراوە و پشت دەبەستێتە سەر کیتاب وسوونە! بەراستی زۆر باش وەسفی حاڵی خۆت کردوە لەو قسەیەی کە عەرەب بە گاڵتەیەکی نیمچە سەرسامیەوە وەسفی عینادی کوردی پێ دەکەن، دەڵێن: کە کورد گووتی نا یانی نا! دیارە تۆ وەك ستایشی خۆت بەکاری دەهینیت، ولەوە دەچێت لە بەرامبەر ئەو هەموو ئامۆژگاریانەی کە کراویت و دەکرێیت بڕیارت داوە بڵێیت: نا! ئێمەش دەڵێین: نا، نا! وادیارە تۆ دوا دەرفەتت لەدەست خۆتدا بۆ تەساڵوح کردن لەگەڵ خۆت ومیللەت وخەڵکدا! من پێموایە تۆ یاریەکەی خۆرئاوات لە دڵدا خۆش هاتووە، میدیا و ناوبانگ و ماف پارێزرا و دەوڵەتی یاسا و کۆمەڵگایەکی کراوە و رۆشنبیر و هێمن، باوەڕناکەم نەزانیت ئەگەر بێیتەوە هیچ لەو شتانە چاوەڕێت ناکەن جگە لە پێچەوانەکەی نەبێت! وەك ئۆجەلان هەڕاج دەکرێیت! بۆیەش وا هەموو داوەکانی پەیوەندی خۆت لەگەڵ ئەو ئەگەرە دەپچڕێنیت شەعرەی معاویەش ناهێڵیتەوە.

## کەس چاوەڕێی فەتوای مەلا کرێکار ناکات تا پێیان بڵێ داعش چین

مەلا كرێكار و فەتحێكی تری ئیعلامی! چاوپێكەوتنەكەی جەزیرەی فەتحێكی ئاسان بوو چونكە، جەزیرە خۆی لەو بازنەیە دەخولێتەوە، بۆیە هونەری تێدا نەبوو بەڵام كاتێ تەلەفزیۆنێكی كوردی میللەتێكی لە حاڵەتی شەردا كە پێویستی كرد چێتە چاوپێكەوتنی كەسێك چەند ڕۆژێكە ئەوەی خراپە بە كوردی گووت و بچوكترین هەڵوێست نەبوو بێت لەسەر كورد، وپێشمەرگەش سارد بكاتەوە و گاڵتە بە قوربانیدانیان بكات، لێرەدا دەبوایە ئەو كەسەی دەینێرن زۆر بە عینایەت هەڵبژێردرابا، بەڕاستی كە گوناهن ئەو تەلەفزیۆنانە، هەتا ئێستا فێر نەبوون كە گفتوگۆ هونەرە، زانستە، تەكنیكە NRT !گوایە لە باشترین تەلەفزیۆنەكانیشە ئینجا وادەزانێت، ئەگەر گەنجێكی قۆزت نارد بە مایكێكەوە وبە چەند پرسیارێكی حازرەوە ئیتر تەواو چاوپێكەوتنێكی باشی لێ بەرهەم دێ!! نازانن بۆ چاوپێكەتن لەگەڵ مەلا كرێكار، كەسێكی دەوێت خاوەن باگراوندێكی مەعریفی وئیسلامی و سیاسی باش، ئاگاداری بەڵگە و دژە بەڵگەكان بیت، تا بتوانێت لە ئاست قسە وبیركردنەوە و ئارگیومێنت وبەڵگەكانی ئەو بێت، نەك نەزانیت ناوی محمد المقدسی یش بخوێنیتەوە، نەك نەتوانیت كەلەبەرەكان وقسە هاڤدژەكانی مەلا كرێكار بدۆزیتەوە، وكە دەیان پرسیاری شەرم ئاوەر و موحریجی بۆ دروست كات، تا بیهێنێتەوە بۆ سەر ئەرزی واقیع! هەستم دەكرد كابرای پێشكەشكار وەك نێجێرێک ڕای دەكرد تا زوو دەربازی بێت لەو بەرنامەیە؟! ئینجا لە • دەیەوێت وەك ڕاشد الغنوشی بگەڕێتەوە !! مەلا كرێكار دەیەوێت وەك ڕاشد الغنوشی بگەڕێتەوە كەچی وەك زەواهیری بیر بكاتەوە.

ڕاشد الغنوشی لە زۆربەی كەسایەتی و سیاسیە سێكیولارەكان دیموكراتی ترە، بە بەڵگەی ئەوەی زیاتر لە نیوەی خەڵكی تونسی لەگەڵدا بوو، بەڵام زۆر بە دیموكراتیانە دەسەڵاتی بەجێ هێشت، تۆ ١٠% ئەو خەڵكەت لەگەڵ بێت

هەڕەشە نەك لە كورد، بەڵكو لە ئەوروپاش دەكەیت! دیارە داعش [**دولە الخلافە**] تەنها بە وەفد و قاسیدی عەمەلی دەناسرێت؟! یانی ئەو هەموو سەربڕین و وێرانكاریە و ١٠٠٠ پێشمەرگەی شەهید هێشتا نایان ناسێنێت؟! كاتی خۆشی كە باسی صدام مان دەكرد، عەرەبەكان وایان دەگووت، بیانووی ترێیان پێ دەگرتین، و دەیانگووت :كێ دەڵێت صدام وای كردوە، كێ دەڵێت ئەو بوو كیمیاوی لێدان؟!!! دوایێ وەرە پێمان بڵێ كە حەزرەتی محەمەد ئەسحابەكانی ئاڕاستە كرد بۆ حەبەشە بۆ كۆچ كردن، بەر لەو فەرمانە وەفد و قاسیدی ناردبوو؟! یان تەنها ناوبانگی پیاوچاكی نەجاشی گەیستبووە مەكە.

باشە خۆ بەدشۆرەتی داعش گەیشتۆتە هەر چوارپارچەی دنیا، هیچی خراپ ونا ئینسانی نەماوە بیكەن، هێشتا دوودڵێ نایانناسیت؟ • خەڵك خەریكە لە ئیسلام دڕدۆنگ دەبێت سەبارەت بە داعش!! شێخ ڕەزای تاڵەبانی باشی فەرمووە: عومەرم دی عومەری پێشووتریش وابێ گەردنی شیعە دوو سەد دەفعە لە سەب ئازابێ ئەمڕۆ زمان حاڵی كورد وەك شیعرەكەی شێخ ڕەزا دەڵێت: ئیسلام و خەلافەت وموجاهیدانمان دی، ئەگەر ئەوانەی پێشووش وابێ، گەردنی ڕەخنەگران وتانە لێدەران وگومان لێكەران لە ئیسلام سەد دەفعە ئازابێ! نیوەی كورد لە ڕقی داعشی بۆگەن وخوێڕی ومرۆ كوژی، كافر بە خوا و بە ئادەمیزاد خەریكە ڕقی لە خودی ئیسلام دەبێتەوە، لەبەر خۆ پەردەپۆش كردنیان بە ئاینی ئیسلام و بەكارهێنانی دەقگەلێكی زۆر و زەوەند لە سەرچاوەكانی ئیسلامدا، بە تایبەت لە دەقەكانی حەدیس، وهەندێكیشیان لە قورئان بە ئەئویلاتی تایبەتی خۆیانەوە، تا بە دەردی مەرامەكانیان بخوات.

جا خەڵك لە دژی داعش رقی هیندە بڕ بكات بیر لە كاردانەوە بكات لە دژی ئیسلام، دەبێت مەلا كرێكارێك چ ئەرزشێكی هەبێت پاش ئەو قسە سووك وبێ

ناوەرۆکانەی کە بۆ بەرژەوەندی داعش کردنی، تا هیچیتر خەڵك گرنگی وبایەخی پێ بدات؟! پاش تاوانبارکردنی کورد بە بەرپاکردنی شەڕ لە دژی داعش! پاش ناوهینانی کەللەپووتە سەربڕەکانی داعش بە موجاهید! پاش ناوهێنانی خەلیفەکە بەعسیەکەی موسڵ، بە دکتۆر ابوبکر البغدادی ودەوڵەتەکەی بە دەوڵەتی خەلافەت! پاش سووکایەتی کردن بە خەبات وجیهادی پێشمەرگە دژی ئەو تیرۆرستانە! دەڵێیت ئەو شەڕە شەڕی کورد نیە! باشە تۆ خۆت دەڵێی پاس ئەوەی سەۆک بارزانی باسی سەربەخۆیی کرد ئاوا داعشیان پیوە ناین، باشە دەبێت داعش شەڕی کێ بکات؟! شەڕی کۆنە بەعسی، یان شەڕی قەتەر وتورکیا، یان شەڕی ئێران، یا ئەمریکا؟! پاش هەڕەشە کردن لە کورد بە پێنج شەش هەزار داعشی خۆت لە کوردستان و لەگەڵ ٦٠٠ کەسیش لە ئەوروپا!!! ئەو ژمارانە لە قسەی مەلایەك دەچێت کاتی خۆی لە سەردەمی بەعس، هەندێ زاق وزیقی کرد، کە پێیان وتبوو بەسە ئیتر ئیحترامی خۆت بگرە دەنا واو و وات لێ دەکەین! یەکێك گووتی مامۆستا بۆ ناجیتە دەرەوە.

گووتی: ئەگەر ئەمن بچمە دەرەوە دە پازدە هەزار کەسم لەگەڵ دێنە دەرەوە! کە ڕۆیشتیش بەس خۆی دەرچوو! خەڵکێك ئەوە کاردانەوەی بێت بەرامبەر هەتا موقەدەساتی کە داعشی خوێڕی گومانی لەویش خست لای کەسانێکی زۆر بەداخەوە !دەبێت مەلا کرێکار چ قودسیەتێکی هەبێت پاش ئەوەی بەرەی دوژمنانی گەلی هەڵبژارد؟ ئەگەر کەمیك گوێی لەو جوێنانە بێت کە پێی دەدرێت لە ژیر کۆمێنەکاندا دەزانێت نرخی گەیشتۆتە کوێ لای کۆمەڵگەی کوردی بەو هەڵوێستانەی، چونکە ئەگەر ئەو داعش ناناسێت و ناتوانێت بڕیاری لەسەر بدات، ئەوە خەڵکی ئاسایی و کوردپەروەر و موسڵمانی نا داعشی، هەموویان داعش دەناسن هەتا بە حزبە ئیسلامیە مەدەنیەکانی

بەژداربووی پرۆسەی سیاسیشەوە! هەموویان دەزانن: ئەو داعشانە نە موسڵمانن، نە ئینسانن! بەڵاو قوزەلقورتن بەسەر ئیسلام و مرۆڤایەتیەوە، لە مێژوودا وینەیان نەبووە لە نامرۆیی و بێ ڕەحمی و قەسوەت وگاڵتەكەر بە خوێنی ئادەمیزاددا، دەزانن هەتا خەواریجێ فەقیر لە چاو ئەوان فەیلەسوفی دیموكراتیەتن! كەسیش چاوەڕێی فەتوای مەلا كرێكار و میزانی جەرح وتەعدیلی ئەو ناكات تا پێیان بڵێ داعش چین.

## درێژەپێدەری داعشیەت كێن، بۆ دروست دەبن

# بەشی حەفتەم

## درێژەپێدەری داعشیەت كێن، بۆ دروست دەبن؟

لەسەر ئاستی گشتی جیهانی ئیسلامی هۆكارێكی زۆر هەن كە بەشداری دەكەن لە پیشەسازی داعش و داعشیەت، ئەگەرچی خۆشیان وەك دژی داعشیەت نیشان بدەن، چەندین بەرنامەی میدیایی و حكومییان هەبێت بە ناوی جەنگان لە دژی توندڕەوی و تیرۆریزم.

### 1- سعودیە وەک کارخانەی سەرەکی داعشیەت

یەكەم بەرهەمهێنەری داعش دەوڵەتی سعودیایە، كە لە قوتابخانەی سەرەتاییەوە منداڵەكان فێری دەمارگرژی و دوژمنكاری دەكات، دژی ناموسڵمانان و موسڵمانانی مەزهەبەكانی تری نا وەهابی، ئەگەر بزانیت ٢٥ هەزار قوتابخانەی حكومی هەیە و پێنج ملیۆن قوتابی تیایدا دەخوێنێت، وسەرەڕای ١٩ قوتابخانەی ئیسلامی سعودی لە خۆرئاوا وەک ئەمریكا و بەریتانیا و ئەڵمانیا هەیە، كە پەروەردە دەكرێن لەسەر ئەو مەنهەجە بوغزاویەی سەلەفیەت، دەبێت قەبارەی زیاندان لە ئاشتی ومرۆڤایەتی و لێبوردەیی چەند بێت.

ئەگەر لە ئەكادیمیەی مەلیك فەهد لە لەندەن، وەك ڕۆژنامەی دەیلی تێلێگراف كاتی خۆی ئاماژەی پێدا بوو، لە یەكیك لە پرسیارەكانی تاقیكردنەوە بۆ منداڵەكان هاتبوو: باسی نمونەی دینە بە تاڵەكانی وەك مەسیحیەت و جولەكایەتی و بت پەرستەكان بكە، ونمونەش بدە لەسەر مەسخ كردنی

جولەكە بۆ مەيمون وبەراز؟! ئەوە لە لەندەن بگوزەرێت كە ياسا هەرگيز لێبوردەيی نيشانی ئەو جۆرە بيركردنەوەيە نادات، گوايە چاويان بە مەنهەجەكەيان خشاندۆتەوە بۆ ئەوەی بە كەڵكی گونجان بێت لەگەڵ پێوەرە ئەوڕوپاييەكان! ئەی دەبێ لە ناو سعوديە چ بگوزەرێت.

كاتێ منداڵێكی دەساڵی لە خانەی هەتيوان ليی دەپرسن كێ نمونەی باڵای ئەوە، لە وەڵامدا دەليت: بن لادن!! دەبيت بزانن ئەوان بەو مەنهەجانە داعشيەت دروست دەكەن. بۆيە سەير نەبوو كە ١٥ لە ١٩ ی ئەوانەی كردەوەی ١١ی سەپتەمبەريان كرد لە سعوديەكان بوون، زۆرترين ڕێژەی داعش ونوسرەتيس لەوان پيك دێت. كاتێك شێخێكی توندڕەوی سعودی بەناوی يوسف الاحمد، كە داوای كرد هەتا حەڕەم بڕوخێنرت لەبەر تێكەڵاوبوونی پياوان وژنان، ودژی مامۆستای ژنە بۆ منداڵانی يەك ودووی سەرەتاييش، لە سەری ليستی دانەرانی كتێبی [الفقه و السلوك] ی پۆلی يەكەمی سەرەتاييدا دەبێت، دەبيت ئەو منداڵانە چيان لێ دەرچێت.

## 2- دەسەڵاتی كوردی دايەنی كۆرپەی داعشيەتە

وتمان ئەوانە دەوڵەتی بەدونشين و بيابانی عەرەبن، بەڵام گوناه نيە لە وڵاتێكی وەك كوردستان لە پێناو پلانێكی سياسی ئەمنی كورتبينندا، دەرگای ئەو كۆمەڵگايە جوان و دوورە لە توندرەوی دينيە، لەسەر پشت بكەينەوە بۆ ڕێچكە وكەسانێك كە كارخانەيەكی لەسەرخۆی داعشن؟ دەسەڵات شەڕی داعشی چەكدار دەكات، بەڵام يارمەتی وپشتگيری لە دانانی گەرای داعش دەكات! ڕاستە بۆ نمونە سەلەفيە مەدخەليەكان ئەمڕۆ ئێوە بە وەلی ئەمر دەزانن، دژايەتی هەموو جۆرێك چالاكی مەدەنی و سياسی دەكەن، بەڵام لە نێوان

سەلەفیەتێکی داعشی و سەلەفیەتێکی مەدخەلی یەك دوگمەیە، چونکە ژێرخانی مەنهەجەکە هەردووکیان یەکن، تورە بوونێك و هەڵچونێك و فشارێکی توندڕەوان بەسە بۆ ئەوەی مەدخەلیەك ببێتە سەلەفیەکی داعشی. ئینجا هەتا لە حاڵەتی مەدخەلیزمیش، کەسێکی ناحەز بە کۆمەڵگا وکرانەوەی دروست دەبێت، بەچاوی گومان دەڕوانێتە دین و ئیمانی ئەو خەڵکە، سەد تۆمەتی بیدعە و فسوق و لادانی دەخاتە پاڵ، تەنها کە دەگەنە سەر حاکم بێ دەنگ دەبن، هەتا حاکم نەوروژێنن تا هێدی هێدی کۆمەڵگا دەکەنە داعش، وگەنجانێکی دابڕاو لە واقیع و ولە کۆمەڵگا و لە میللەت و لە سەردەم دروست دەکەن جیهان بڕوخێت بەسەر میللەتەکەی گوێی لێ نیە و مێشێك میوانی نیە، گرنگترین شت ئەوەیە کەس نەچێتە سەر قەبر بۆ زیارەت و دوعاکردن، و لە کاتی بانگدان کەس سەڵەوات لە پێغەمبەر [صلى الله عليه وسلم [نەدا، شەرواڵەکان کورتکرێنەوە، و ڕیشەکان بەردرێنەوە، و سمێڵکەکان قووت کرێنەوە، ڕووپۆشەکان بەردرێنەوە!! هەر بۆیەش کە دەبینی لەو ساتە ناسکانەی کە تێیدان کە کوردستان ڕووبەڕووی درندانەترین هێرس بۆتەوە، تەلەفزیۆنی ئامۆژگاری دەڵێی لە بەهەشتی سەلەفی سالح دەژێت، هەر وەعز وپرسیار و وەڵامە لەسەر بیدعە و سونە و، و عەزابی قەبر و نیشانەکانی دەجال و مەهدی و لێدانی کاسێتەکانی ئیبن عسیمین و ئەلبانی وشێخەکانی تری سەلەفیەت.

## 3- ترسنۆکی ڕۆشنبیرە ئیسلامیە میانرەوەکان داعش دروست دەکات

ئەوەی لە بواری فیکر وهزر کاردەکات دەبێت جورئەتی فیکری هەبیت پێش ئەوەی دکتۆرا و ماستەر وئەلقابی زەبەلاح، کە زۆر لەو خاوەن ئەلقابە زلانەمان دیون بای جورئەتی توندرەوێکی نەخوێندەواریشیان تێدا نیە! کێشەی ڕۆژهەڵات

ئەوەیە کە توندڕەوەکانی بەوپەڕی حەماسەت ولەخۆبردنەوە پشتگیری لە هزرە سەقەتەکانیان دەکەن، کەچی میانڕەوانیان لە ئاستی دکتۆرا و لەقەبە زلەکانی تر، ناوێرن فزە بکەن، ودڵی شەیتانی ڕەجیمیش ناشکێنن! بۆیە بەڕای من بڵاوبوونەوەی تووندڕەوی سی بەشی تاوانەکەی لە ملی حزب و کەسایەتی وڕێکخراوە بەناو وەسەتیەکان ومیانڕەوەکانە!

زۆرن ئەوانەی کە دەم دەکەنەوە لە باسکردنی کێشە وباسە فیکریەکان لە ڕووی تیۆریەوە، وادەزانیت گوێ لە ئیبن ڕوشد دەگریت، کەچی ڕۆژێک لە ڕۆژان هەڵوێستێکی هزری وفیکری شایستەی وایان لێ نابینین، کە بڕی ١% پاڵپشتی قسە تیۆریەکانی بکات.

کەسانێکن هەڵدەکەن لەناو حزبی بێ هزر و تەژی لە دوژمنانی هزر وبیرکردنەوەی تەقلیدی لە سەلەفیەکان وسیاسیە هەلپەرستەکان، کەچی هیچ کێشەیەکی نیە لەگەڵ ئەوانەی ڕۆژانە ژەهری توندڕەوی دەڕێژنە ناو کایەکانی کۆمەڵگاکەمان ومێشکی لاوەکانمان، بێدەنگە لە هەموو قەباحەتەکان بەوپەڕی ترسنۆکی وبێ جورئەتەوە، بۆتە پاسەوانی بتە کۆنەکان، نە بە نهێنی ونە باشکرا ناوێرێت باسی بت و تابۆکان بهێنێت.

کەسانێك کە خۆیان بە خاوەن هزر وپرۆژەی هزری زەبەلاح دەزانن بەڵام لە یەك کاتدا لەگەڵ یەکێتی، یەکێتی بیت، ولەگەڵ گۆڕان، گۆڕان بیت، ولەگەڵ پارتی پارتی بیت، ولەگەڵ کۆمەڵ، کۆمەڵ بیت، ولەگەڵ یەکگرتوو، یەکگرتوو بیت، لەگەڵ سەلەفی سەلەفی بیت، ولەگەڵ ئەشعەری، ئەشعەری بیت هتد، چی دەمێنێتەوە بۆ فیکر لە ناو ئەو فەزایە پڕ لە ترسنۆکی وبێ جورئەتی و دڵی مێشێك نەڕەنجانەدا.

داعشیەت بە ترسنۆکی ڕۆشنبیرە ئیسلامیەکان دروست دەبێت، لەوانەی لە ترسی توندڕەوان ناوێرن هەتا کتێبێك، نامیلکەیەك، وتارێك، بەڵکو پۆستێك و کۆمێنتێك بڵاوکەنەوە ئەگەر پیچەوانەی کرد لەگەڵ چەمکەکانی سەلەفیەتی توندڕەو. وادەزانن میانڕەوی ئەوەیە لەگەڵ میانرەوان و توونددڕەوان وەك یەك بیت ودڵی هیچیان نەڕەنجێنیت نەوەك پلە وپایە وکورسیەکەت لەق بێت! چونکە ئەو مشەخۆرانەی بە ڕێکەوت کەوتونەتە ناو میانڕەوی نایانەوێت دەنگی توندڕەوانیش لەدەست بدەن بۆ پرۆژە و ئاواتە کەسێتیە تایبەتەکانی، حەزیان لێیە هەردەم سەرۆک کۆڕ و ڕێکخراو و شتیتر بن، کەچی قوربانی نەدەن بە وتنی قسەیەکی هەق بەرامبەر بیرکردنەوەی توندڕەوان، نەوەك زیانێکی مادی کەسێتی بکات.

## 4- بێ هەڵوێستی حزبە ئیسلامیە میانڕەوەکان داعشیەت دروست دەکات

کە میانڕەو دامەزراو نەبوو ، تەژی بوو لە حزبایەتی و دەمارگیری دەستەگەری، وبەڵگەی مەنهەجی میانرەوی پێ نەبوو، فێری توێژینەوەی زانستی نەکرا لە پوچەڵکردنەوەی بنەماکانی فکری توندڕەوی، زۆر ئاسانە لە نێوان شەو و ڕۆژێکدا ببێتە توندڕەوێکی تۆبەکار لە میانڕەوی.

داعشیەت بە لەرزەلەرزی ئیخوان و بەناو وەسەتیەکان دروست دەبێت، کاتێك شەو و ڕۆژ باس باسی میانڕەویی دەکەن، بێ ئەوەی چالاکیەکی کاریگەریان هەبێت بۆ پوچەڵکردنەوەی بنەماکانی سەلەفیەت! نەك هێندە بەڵکو زۆرجار ژمارەیەکی زۆری ئەو وەسەتیانە لە ژێر کاریگەری مەنهەجی سەلەفیەتدان، و زۆرجار پێت جیا ناکرێنەوە.

بۆ نمونه ئەو هەواڵه شۆك هێنەرەی یەكگرتوو بوو كه لەواڵیرۆژنامەنووسێكی ناوداری یەكگرتوو دیم كه دەڵێت: " له چوارچێوەی ئیصلاحاتی فیكری و سیاسی و كرانەوە و تەجدید به بیانووی دەنگ كەم كردن، چەند كەسێكی دەسترۆیشتووی بڕیاریانداوە له ئایندەیەكی نزیك یان دوور (بێژەری خوشك) له سەر شاشه قەدەغه بكەن، فەشەلی قیادەكردنی خۆیان دەخەنه سەر (رەگەزی مێ) و دەستی چەوری خۆیان به لەچكی ئافرەتان دەسڕن" دیارە یەكگرتوو لاسایی دڵشاد كەلاری سەلەفی دەكەنەوە، كه ئەویش پێش ئەوان گووتی حەڕامە كچی بێژەر لەسەر تەلەفزیۆنی كۆمەڵ بێت! له جیاتی ئەوان ڕەخنه لەو لۆژیكه سەقەتەی دڵشاد بگرن، كه هەتا لەناو كۆمەڵیش لێی بێدەنگ نەبوون، دیارە ئەو چەند دەسترۆیشتووانەی ناو یەكگرتوو له جیاتی گەڕان به دوای هۆكارە هەقیقیەكانی ئەو نوشوستیه گەورەی هەڵبژاردنیان بەدوای ئاسانترین و لاوازترین قوربانی دەگەڕێن تا تۆڵەی فەشله سیاسیه گەورەكەی خۆیانی لێ بكەنەوە و دەستی چەوری خۆیان به لەچكی ئافرەتان دەسڕن، به گوزارشی كاك محمود یاسین كوردی؟! له جیاتی دانیشن و توێژینەوەیەكی ورد و زانستی هۆكاری فەشەلیان بكەن، له جیاتی ئەوە پەنایان بۆ هۆكارێكی توندڕەوانه بردووە كه كەسانێك له سەلەفیەكان پێیان وایه كه یەكگرتوو كەوتوەتە ژێر كاریگەری هێزە عەلمانییەكان و خەریكه وەك ئەوانی لێدێت بۆیه یەكگرتوەكان لەبەر غیابی وەعی وهۆشیاری میانڕەوی جگه له دروشم وئیدیعادا، به ئاسانی كەوتونەتە ژێر كاریگەری ئەو وتارە غەیبیه و غەبیەی سەلەفیەكان وداوا دەكەن یەكگرتووش بەرەو داخراوی ببەن تا خەڵك لێیان ڕازی بێت.

## 5- پاشەكشەی میانڕەوان له بەرامبەر وتاری توندرەوی داعشی

ئەو کۆمەڵگایانەی لە ژێر کاریگەری ئایینیدان، هەرچەندە میانڕەو بن، جێگای ئەمان نین، لە ساتێکدا ڕەنجی دەیان ساڵەی میانرەوی بەبادا بدەن و پارێزگاری موود ومیزاجی ئایینی میانرەوی خۆیان بکەن بۆ هەتا هەتایی. ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ زۆر هۆکار لەوانە کاتێك توندڕەوان تا دێن توندرەوتر دەبن، ڕەخنە و گاڵتە و تەوس ئاڕاستەی میانڕەوان دەکەن، زۆرجار لەبەر بی بناغەیی و میانڕەوی شیعاراتی ودروشمی بەبی قوڵبوونەوە لە لۆژیکی میانرەوی و کارکردن لەسەر ڕووتکردنەوەی بنەما و لۆژیکی توندڕەوی بە شیوەیەکی زانستی، ئەو کەسە زۆر بێ هێز دەکات بەرامبەر لاقرتێی توندڕەوان وهەوڵی پوچەڵکردنەوەی ئەو ڕەخنانەی توندڕەوان لێانەوە دەگرن، نەك بە تێکشکاندنی بنەماکانی توندڕەوی، بەڵکو بە موسابەقە لەگەڵ کردنیان و نزیک کردنەوەی وتاریان لە وتاری توندرەوان، تا بڵێ ئەوە نیە منی میانڕەویش وەك ئێوەی توندڕەو بانگەوازی ئەو کار وبیرانەی ئیوە دەکەم، کەوابوو منیش موسلمانی ڕاستەقینەم وەك ئێوە، تاکەی پیرۆزیم پێ نادەن.

ئەو لۆژیکە هەر لە کۆنەوە لەناو مێژووی ئسلامدا هەبووە، هەر لەپاش سەرکەوتنی مدرسەی سەلەفیەتی ئەهلی حەدیس بەسەر گۆڕەپانی ئیسلامی زۆر لە زانا و شوێنکەوتووانی مەزاهیب و ڕێچکە بەهیزە نا سەلەفیەکان تووشی جۆریك لە توانەوە بوون لەناو مەقولات و جیهانبینی تەسکی سەلەفیەت، کەزۆرجار بوەتە هۆی لەناوچوونی مەزاهیبی زۆر گەورە ومەزن ومرۆدۆست، وەك مەزهەبی ئیمامی ئازادیخوازان ئەبو حەنیفە، کە لەبەر ڕێچکە گۆڕینی قوتابیانی، هەموو بیرورا ناوازەکانی ئەو ئیمامە بەدەستی قوتابیانی خۆی سەرەنگووم بوو، بەڕادەیەك گومان لە هەموو ئەو قسانە دەکەیت کە لە کتێبەکانی پاشە خۆی دراوەتە پاڵی، و وەك ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و شافیعی

وێنا دەکرێت، کە کەسێك بووە بە موو جیاوازی نەبووە لە سەلەفیەکانی ئەهلی حەدیس.

بۆ نمونە قوتابی یەکەمی ابو یوسف القاضي هێشتا ابو حنیفە لە ژیاندا بوو کە خەریکی حەدیس و بایەخدان بوو بە حەدیس تا وای لێهات بوو بە حافظ و ثقة ی ناو ئەهلی حەدیس، ئەوەش خۆی لە خۆیدا دابڕانێکی مەعریفیەلەگەڵ مەنهەجی ئەبو حەنیفە کە دەڵێن تا مردیش باوەڕی بە بیست حەدیس نەبوو لەو بەحرە بێ سەربنەی حەدیسدا، هەرچەندە هێشتا تۆمارکردنی بە شێوەیەکی بەرفراوان دەستی پێ نەکردبوو، ئەبو حەنیفە پەیڕەوی ئیسلامیکی قورئانی و عەقڵ ولۆژیکی دەکرد وەك دامەزرێنەری قوتابخانەی ئەهلی رەئی. قوتابیەکەیتری حاڵی لە ابو یوسف باشتر نەبوو، محمد بن الحسن الشیباني وەك ئەهلی حەدیس بەدوای کۆکردنەوەی حەدیس گەشتی دەکرد و بوە یەکێك لەوان، هەر بۆیە فیقهـ و بیروڕاکانی ابو حنیفە لە قۆناغی نوسینەوەیدا گۆڕانکاریەکی ڕەگ وڕیشەیی بەسەرداهات و دابڕانێکی مەعریفی لێی ڕوودا، و حەنەفیەکانی پاش ئەو دوو میراتگرەی ئەبو حەنیفە هەر خەریکی بەرگری کردن بوون لە ئەبو حەنیفە کە لەلایەن ئەهلی حەدیس بە توندترین شێوە سەرکۆنە دەکرا تا رادەی تەکفیرکردنی، بەڵام بەرگری حەنەفیەکان لە ئیمامی ئەبو حەنیفە لە هەمان کاتدا سەرکەوتن بوو بۆ سەلەفیەکان و شکست بوو بۆ ئەبو حەنیفە، چونکە هەموو بەرگریەکە بۆ ئەوە بوو بیسەلمێنن کە ئەبو حەنیفەش فەرمودەپەروەر بوو وەك سفیان الثوري و ابن معین و الاعمش و احمدی کوڕی حەنبەل....هتد

بەو شێوەیە هەموو کەلەپوری ئازادیخوازانەی ئەبو حەنیفە بەدەستی قوتابییەکانی خۆی زیندەبەچاڵ کرا وتەحریف کرا، ومن گومانم نیە لەوەی

زۆربەی بیروباوەڕەکانی کە لە پێناویاندا ئەبو حەنیفە حەشری پێکرا لەلایەن قوتابخانەی ئەهلی حەدیس ، هەر بەدەستی قوتابیانی دوورخرایەوە لە تۆمارکردنی، ئەوەندەشی پێمان گەیشتوە لەلایەن نەیارانی پێمان گەیشتوە کە دوور نیە جەندین موبالەغات و درۆشیان خستبێتە سەر، لەگەڵ ئەوشدا لە نیو ئەوانەی ناحەزانیشی گواستیتیانەوە دەتوانین جوانی وئازادیخوازی و بلیمەتی ئەبو حەنیفە بەدی بکەین.

## ترسی دینداری منداڵەکانمان

لە پێشوودا خەڵک زۆر دڵخۆش دەبوو بە منداڵانی ئەگەر ڕوویان لە دینداری کردبا، دەیاندیت لە ماوەیەکی کەمدا منداڵیان هێمنتر و بە ئەدەبتر و

ڕیزدارتر دەبوو، دوور دەکەوتەوە لە کاری خراپە و ڕەوشتی بەد، ئێستا خەریکە خەڵکەکە دەزانن کە دینداریش بۆتە مەترسیەك بۆ سەر منداڵەکانیان، چونکە کێشەکە ئەوەیە ئەو لاوچاکیە تەنها قۆناغی یەکەمی دینداریە، هەر کە پێینایە قۆناغی وەلاء وبەرا ء و جیهاد و فەزڵی موجاهیدان ، وگۆڕینی دیاردە شیرکیەکان و بیدعەکان و گوناهەکان، و بەسوک سەرنجدانی دینداری دایك وباوک و دەوروبەری، قۆناغی سوور هەڵگەڕانی ڕوخسارت لە غیرەتی بۆ مەحارمی خوا! لێرەوە سەرئێشەی ئەوان دەست پێدەکات، زەردەخەنەی جارانی نامێنێت، ڕیز و حورمەتی جارانی نامێنێت، ئەزیەتی خوشکانی دەدات بە لێدانیش ئەگەر تاڵە قژێکیان بە دەرەوە بوو! تەلەفزیۆن قەدەغە دەکات، ناچێتە گەشت و بۆنە کۆمڵایەتیەکان، هیچ بایەخێکی بە میللەت و نەتەوە و خەمەکانی نامێنێت، بەڵکو تەنها بیرکردنەوە لە خەمەکانی نیشتیمان ونەتەوەی بە بە سیفەتێکی جاهیلی دەزانێت ئەگەر بۆی بلوێت لە پێناو عەقیدەی پیرۆزی ڕێگای جیهاد دەگرێت لە دژی کەس وکار و نەتەوەکەشی.

بێگومان لەبەر ئەو نائومێدی وبێ کاری وبێ مەعریفەتی وبی ئایندەییەی کە باڵی بەسەر گەنجانی وڵاتانی ئیسلامیدا کێشاوە، زۆر لەو گەنجانە کە دەبینن هیچ ڕێگایەك نییە بۆ گوزارش کردن لە خۆیان ولەبەر داپلۆسینی سیاسی وگەندەڵی بەرفراوانی دەسەڵاتداران بەرەو ئەو بیرۆکانەی بەهەشت و جیهاد هەڵدەکشێن بە فەزڵی ئەو هەموو مینبەر و بەرنامە بینراو وبیستراوە ئاینیەی کە هەموو تەرکیزیان لای ئاخیرەتە، وناوێرن بە قەرەی دنیادا بچن لە ترسی داپلۆسینی پۆلیس و ئاسایش! دەسەڵاتی بێ سەروبەریش بە کورت بینی خۆی گۆڕەپانی دینداری تەسلیم کردوە بە ڕەشترین هێزی دینی کە دەیەوێت ئەو وشیارەیەی نەتەوەی کورد هەیەتی لە دینداری میانڕەو و پێکەوە ژیانی و بێ

دەمارگرژی و قبوڵکردنی ڕوحی نوێخوازی، هەمووی قوربانی عەقڵیەتی گەندەڵی دینی سعودی سەلەفی مەدخەلی و مەخرەجی بکات، بەس ڕەخنە لە دەسەڵاتی سیاسی نەگرن!! ئەوانەی دەسەڵاتی سیاسی کوردستان بەڕێوە دەبەن دەبێت بزانن، بە دەستی ئەو توندڕەوە ئاینیانە سروشتی دینداری میانڕەوی خەڵک دەشێوێنن، و چاڵێکە بۆ گۆڕی خۆیانی لێدەدەن.

## داعش و بەعس لەیەك سەرچاوە دەرکەوتوون

بەڕای من داعش بەرهەمی بەعسیەکانی دوا ساڵەکانی حوکمی صدامە، بەعس لە هەموو ئەدەبیاتی خۆی جۆرێک لە تەمەلوق و تەفسیری بەعسیانە

بۆ ئیسلام دەکات، لەکاتی تەنگەتاوەکانی بەعس زیاتر جەختی لەسەر وتاری دینی دەکردەوە، بەپێچەوانەی کاتەکانی تر، لە پاش شکستەکانی لە جەنگی خەلیجی دووەم، صدام لە دووا ساڵەکانی زۆر جەختی لەسەر ئایین و حەملەی ئیمانی و قورئان لەبەرکردن لە قوتابخانەکان و دیاردەی ئایینی تریش دەکردەوە. بەعسیەکان دیتیان بە کەمێك نیفاق و دووڕوویی ئیسلامەتی توانییان سەرتاسەری ئیسلامیەکانی جیهان فریودەن وبە خۆڕایی و بە هیمەت و بە قیمەت بۆیان بینە سەر شەقامەکان و ڕۆژانە خۆپیشاندانیان بۆ بکەن، بەداخەوە ئیخوانی دەوڵی ڕۆڵێکی سەرەکیان گێڕا لەو فریوخواردنە بە صدام! کار بەوە گەیشت ئیسلامیەکان و نەتەوەییە عەرەبەکانی زۆر وڵاتی وەك ئوردن و یەمەن و مۆریتانیا و مغرب و میسر و سودان و پاکستان و بەنگلادیش وێنەی صدام یان لە ماڵەکانیان و دوکان و کۆگاکانیان هەڵدەواسی وەك کەسایەتیەکی سەرکردەی ئیماندار، بەڵام چونکە تازە کارەکەیان دەست دابوێ، هێشتا بەتەواوی دەستیان بەسەر گۆڕەپانەکە دانەگرتبوو تا زیاتر وەبەرهێنان بکەن لەو مەیدانە، بەڵام لە دوادواکانی ڕوخانی صدامی گۆڕبەگۆڕ، دەڵێن ژمارەیەکی باش لە موجاهیدە ئیسلامیەکانی ئەحزابی ئیخوانی وجیهادی لەڕیزی شەڕدا بوون. پاش ڕووخانی صدام ئەو ئەفسەر وسیاسیانەی کە بەرپرس بوون لەو هەڵمەتە ئیمانیەی صدام پەتی پچڕاویان گرێدایەوە و وەك شێرپەنجە بڵاوبوونەوە لە ناو گروپی دینی توندرەوی جیهادی چەکدار ، پاش دامەزراندنی دەیان قەوارەی چەکدار دینی! لە هەمووی گرنگتر چونیان بوو بۆ ناو قاعیدە و انصار السنة و سوپای نقشبندیەکان بوو، هەر لەو ڕێگەوە ابوبکری بەغدادی کە خەڵکی سامەرایە وبە حوکمی پەیوەندی خەڵکی ئەو شارە بە دەسەڵاتی بەعس گومانم نییە لەوەی ابوبکری سامەرائی لە دەوروبورێکی بەعسی تێکەڵ بە خراپترین تەفسیری عروبی سەلەفی بۆ ئیسلام گەشەی کردوە و فرچکی بەو

بیروباوەڕە بەعسیە ئیسلامیە گرتووە، هەر زوو بوە دەستەڕاستیکی زەرقاوی. بەعسیەسونیەکان زانیان قەبارەیان لە عێراق چوتەوە حەجمی حەقیقی خۆی وبەڵکو لەسایەی حکومەتی تائیفی شیعەکان بچوکتریش بۆتەوە، بۆیە هەوڵی قەرەبووی ئەو بچوکیە دەدەنەوە لەڕێگای پان ئیسلامزمی سەلەفی جیهادی، هەوڵەکانیان بە شێوەیەکی کاتیش سەرکەوتوو بووە و توانیتیان هەزاران کەس لە سەدان وڵاتی جۆربەجۆر کۆبکەنەوە شەڕی کورد و شیعەیان پێ بکەن. ئەمڕۆ لەبەرەکانی جەنگی کورد وداعش سەدان وهەزاران مغربی وجەزائری وتونسی و تورکی و ئەوروپی و شیشانی و لە هەمووی سەیرتر چینی و ئەندەنوسی و ئازەربایجان یش دەیان هەزار کیلۆمەتریان بریوە بۆ ئەوەی شەڕ لەگەڵ کورد بکەن لە قازانجی سونەی داعشی بەعسی!!!، ڕاستە ئەو هەوڵە تاڕادەیەك سەرکەوتنێکی کاتی بەدەست هێناوە بەڵام لەبەر ئەوەی ئەو جۆرە بیرکردنەوەە وتوندڕەوییە لە دەرەوەی سیاقی سەردەمە، هەتا زلهێزەکانیش بۆ ماوەیەك بی دەنگیان لی بکەن و وەبەریان بێنن بۆ چەك فرۆشتن و ئامانجی سیاسی تر، بەڵام هەرگیز ناتوانن فشاری هاوڵاتیانیان فەرامۆش کەن، و هەتا ئەگەر گریمان خۆشیان ئەو بتەی داعشیان دروست کردبێت، هەر دەبێت خۆیان بیڕوخێنن! ئێستا کاونتداونی داعش دەستی پێکردوە، هەرچەندە لەسەر زەوی هەموو فشارەکە لەسەر کورد عێراق و سوریایە، بۆیە دەبێت کورد داوای پاداشتیکی گەورەتر بکات لەوەی بە خەیاڵی سەرکردە بێ ڕوئیاکانی تێدەپەڕێت، کە بەو حاڵەوە هێشتا حوکمەتی بەغدا منەتیان بەسەر دەکات.

## دلشاد کەلاری وەك قسەکەرێك بە ناوی داعش دەدوێت

لە ڕونكردنەوەيەك لەسەر پەيامەكەی بەڕێز م عەلی باپير پاش بڵاو بونەوەی ئەو پەيامە(كەمەكتەبی سياسی لەسەر بڵاوبونەوەی يەك دەنگ نەبوون) دلشاد كەلاری وامزانی باسی تەريق بوونەوەيان دكات لەو تاخی بونە پڕ شەرمەزاريە، لە كاتێكدا هەموو كوردستان دووچاری گەورەترين هێرشی تيرۆريستيی داعش بوەتەوە، وسەدان رۆلەی كورد خوێنيان دەبەخشنە ئەو خاكە، كەچی دلشاد كەلاری خەمی دلشكانی داعشيەكانی ناو كۆمەڵ و دەرەوەيتی، نەك خەمی پاراستنی كوردستانی بێت كە ئەمڕۆ

1- دەترسم ئەم پەيامە كۆمەڵی ئيسلامی بكاتە تەرەف لەم شەڕە،منيش بەش بەحاڵی خۆم:ئەم شەڕە لانی كەم بەفيتنەيەك دەزانم ئامادەنيم بەهيچ پاساوێكەوە لەسەر حسابی خەڵكێكی مەزڵومی ئەهلی سونە بچمە بەرەی ئەمريكاو ڕۆژئاواو ئەو وڵاتە ئەقليميەی پشتيوانی و پارێزگاری لەو ڕژێمە خوێن ڕێژە تائفيەی عێراق دەكات(كەدين و ژينی خەڵكی عێراق تێك داوەو ئەم شەڕەش جارێكيتر دەسەڵاتە خوێناويەكەی حكومەتی عێراقی لەهەرەس دەپارێزێ).

2- لەڕوی شەرعيەوە ناتوانم قەناعەت بە خۆم بكەم و خەڵكی هاندەم بۆ شەڕێك خۆمان خاوەنی بڕياری سياسی و سەربازی نەبين و نەشتوانين بە لايەنی بەرانبەر بڵێين موسڵمان نين وێڕای هەموو هەڵەو پەڵەو بێ شەرعی و كەم و كوڕيەكانيان، لە كاتێكيشدا ئێمە هێزی چەكداريمان نيەو لێشمان قبوڵ ناكەن هەمان بێ و بە ورديش نازانين شەڕەكە چۆن هەڵگيرساوەو؟هۆكارەكەی

چیەو؟هەتا کەیەو؟کێ خاوەنی بڕیاری یەکلاکەرەوەیەتی و؟کێ دەتوانێ سبەینێ ڕایوەستێنێ؟

3- بە مافی خۆمی دەزانم بترسم لەگوناهی بەشداری کردن(بەوشەیەکیش)لە شەڕێکی دەوڵی و ئیقلیمی و مەزهەبی کە هەرلایەک بۆ بەرژەوەندی خۆی دەیکاو ڕۆژانە خوێنی خەڵکی مەدەنی سونی مەزهەبی بێ تاوانی بەبەرمیلی پڕ تی ئێن تی وەحشی گەرانەی تەیارە نادیارەکان دەڕژێ و ناشزانرێ کام لەم دەنگۆیانە ڕاستن تەیارەکان سوری یان ئێرانی یان عێراقین؟

## ئەگەر کوردستان سێکیولارو دیموکرات نەبا؛ هەڵوێستی خۆرئاوا چۆن دەبوو

لەوەتی هەم و فامم کردوە ڕازی نەبووم لە دەسەڵاتی کوردی و تایبەت تر لە پارتی و یەکێتی. کە ڕازیش نەبووم لێیان لەبەر هۆی حزبی و ئایدیۆلۆژی نەبوە، بۆ نموونە من ئیسلامی بم ئەوان بە عەلمانی و بێ دین بزانم ، یان چەپڕەو بم ئەوان بە ڕاست ڕەو و بە سەرمایەدار بزانم. نەخێر ڕەخنەی من لەوانە تەنها لەبەر لە دەستدان و فەوتاندنی هەلە زێرینەکان بووە کە دەهاتنە بەردەم کورد و دەیفەوتێنن، ڕەخنەم لەو چەند ئیدارەییە کە لەوەتی ١٩٩١ وە بە دەستی دەناڵێنین تا ئێستاش، لە بوونی پاشاگاردانی چەکداریە لەناو کوردستان، کە لەو جەنگە دژی تیرۆریستانی داعش زۆر ترسناکانە ڕەنگ دەداتەوە، ڕەخنەم لە دیارینەکردنی زمانی یەکگرتووی کوردی فەرمیە، لەو گەندەڵیەیە ولە چەندین شتیترە.

بەڵام ئەو بە تەنگهاتنەی ئەمریکا و ئەوروپا سەبارەت بەوەوەیە کە ئەو دوو هێزە سەرەکیەی نوێنەری دەسەڵاتی کوردین، خۆیان بە دوو حزب و هێزی عەلمانی مەدەنی دیموکراتی دەزانن! جا کێشە ئەوە نیە تا چ ڕادەیەك گوزارش لەو چەمکانە دەکەن. تەنها شتێك کە دەسەڵاتی کوردی و دوو پارتە سەرەکیەکە تێیدا سەرکەوتوو بوون، بریتی بوو لە سەلماندنی ئەو بانگەشەیە بۆ جیهانی دەرەوەی کاریگەر، کە بە پراکتیکی ڕەنگیدایەوە لە دوورخستنەوەی جڵەوی دەسەڵات لە دەستی ئیسلامیەکان بە توندڕەو و میانڕەوەوە، وبەژداری پێکردنیان لە دەسەڵات، و ڕیزگرتنی هەموو ئاینەکان و ئۆلەکان و نەتەوەکانی ناو کوردستان زۆرجار لە ڕادەبەدەریش!، چونکە زۆرجار لەبەر تەنازولاتی زۆر

ڕەخنەی زۆر توندیان لێگیراوە لەسەر نازكێشانی زیاد لە حەدی كەمە نەتەوەكان و كەمە دینەكان، تا ڕادەی ئەوەی زۆرم گوێ لێبوە كە مەسیحی ویەزیدی لە كوردستان برا گەورەن، بە ڕاشكاویەوە دەڵێم منیش تا ڕادەیەک لەگەڵ ئەو ڕەخنانە بووم، ئێستاش لەو باوەڕەدام كە ڕێزگرتن دەبێت لە سنوری ماقوڵ دەرنەچێت، كەمینە نەخشەت بۆ بكێشن چ دەكەیت و چ ناكەیت، بەڵام لەگەڵ ئازادی پێدانی ڕەهام پێیان، وەك هەر هاوڵاتیەكی كورد یەكسان بن لە هەموو ماف و ئەركەكاندا.

لە سۆنگەی ئەو هەرەوەرزیەی ئەمریكا و ئەوروپا بۆ یارمەتی دانی كوردستانی باشوور بەو گەرم وگوڕیەوە، بیری بۆ بابەتێكی هەستیار چوو، ئایە ئەگەر كوردیش وەك نەتەوەكانی عەرەب و تورك [تا ڕادەیەك] و نەتەوە ئیسلامیەكانی تری جیهانی ئیسلام بكەوتبایە ژێر هەژموون و دەسەڵاتی ئیسلامی سیاسی ئێستا حاڵی كورد چۆن دەبوو؟

لە بیرمە چۆن سەدان گەنجی ئیسلامی خەونیان بە دیتنی عبدالله عزام وە دەدیت، چۆن ئەو موجاهیدانەی ئەفغان ببونە قارەمانی گۆڕەپانی ئیسلامی هەزار ئەفسانە و موعجیزاتیان دەدایە پاڵیان، ئەگەر ئەو حاڵەتە ئیسلامیە یان وەك ناوان دەنا بە ڕابوونی ئیسلامی ببوایەتە حاڵەتێكی گشتی و جڵەوی دەسەڵاتی بە دەست گرتبا، جارێ گومانم نیە كە باڵەكانی ناو حزب و بزوتنەوە ئیسلامیەكان  وەك حزب و بزوتنەوە ئیسلامیەكانی ئەفغان دەكەوتنە شەڕ و بە موشەكەكانی حیكمەتیار یەكتریان قڕ دەكرد.  ئینجا كورد چەندە بەدبەختە بەدبەختتر دەبوو، سەرەڕای پشێویی ناوخۆیی، نەبوونی هێز وپشتیوانیەكی دەرەكیش دەبووە سەربار، وئەگەر هێزیكی دەرەكی وەك داعش یان توركیا هێرشی كردبایە سەر كوردستانی ئیسلامی، خۆر ئاوا فەرامۆشی دەكرد وەک

فەرامۆشی گەلانی سوریا لە ترسی گەشەپێکردنی ئیسلامی سیاسی وەك هێزێکی نەیار بە خۆرئاوا، ئەوکاتە داعش یش هێرشی کردبا گوێیان پێنەدەدا خوای دەکرد هەموو کوردیشیان قڕ دەکردا! چونکە داعش و هاوشێوەکانی تەنها دژی شیعە و عەلمانی و لێبڕالەکان نین، بەڵکو دژی ئیسلامیە میانڕەوەکانن تا سەر ئێسقان و دژی توندڕەوەکانی وەك خۆشیانن، وەك دەبینین لە سوریا دژی بەرەی نوسرەن، ودژی سوپای ئازاد و چەندین گروهی ئیسلامیشن و بە دەیان وسەدانیان لێ دەکوژێت وسەردەبڕێت.

بەڕای من کورد لە سایەی ئەو قەسوەتەی جیهانی ئیسلامی و بێ پشتیوانیەتەی پێویستە زیاتر جەخت لەسەر دیموکراتیەت و بەهاکانی مەدەنی بوون بکاتەوە، هەتا لەسەر ئاستی حزبە مەیلدارەکانیش بە ئیسلامی سیاسی، چونکە کورد زۆر پێویستی بەو پاڵپشتیە هەیە، ئەمڕۆ چەندین دەوڵەتی گەورەی خۆرئاوا بە ئاشکرا و ڕاستەوخۆ پشتگیری خۆیان بۆ کوردستان دەردەبڕن جگە لە ئەمریکا، بەریتانیا و هۆڵەندا و ئەڵمانیا و نەمسا و ئیتاڵیا و فنلەندا و چەندینی تریش بە ڕێوەن.

کەوابوو ئەوجارە بە پێچەوانەی بیروڕای هەندێك نووسەری ئیسلامی و یان لەوانەی لە ژێر کاریگەری ئیسلامی سیاسیدا دەنووسن، سیکیولاربوون و دیموکراتی بوونی دەسەڵاتی کوردی ترسی ئەوەی ڕەواندەوە لای خۆرئاوا کە بەبێ ترس ئەو هەموو چەکانە ڕادەستی پێشمەرگە بکەن و ئەو هەموو دەوڵەتە بەهێزانە و بڕیاردەرانەی جیهان وەك دەوڵەتێکی سەربەخۆ هەڵسوکەوت بکەن لەگەڵ کوردستانی باشوور.

## مونازەرەیەکی سەر شەقام لەگەڵ سەلەفیەکان

لە ١٦ی ئابی ٢٠١٤ـدا، لە كاتی بازاڕكردن، كۆمەڵێك سەلەفی شەرواڵ و دیشداشە كورتم دیت. لەو ساتانەدا كە دنیا هەمووی تووشی شۆك هاتووە، لە دەست ئەو وەحشیگەریەی سەلەفیەكانی داعش، كەچی ئەوان لەسەر شەقامێكی گەورە و ناوداری لەندەن بە كۆڵێك ڕیش و كتێب و نامیلكەوە وەستا بوون، خەریكی ڕاگرتنی خەڵك بوون بۆ ئەوەی بانگەوازیان بكەن بۆ ئیسلام، سەیر لەوەدایە زۆر جار سەرنجم داوە زیاتر خەریكی ڕاگرتنی ئافرەت و كچۆڵەی جوانكیلەن، چونكە دەزانن زۆر لەو كچانە یەكەم زۆر بێ ئاگان لەوەی لە دنیا دەگوزەرێت، دووەم زۆربەیان ماندوو و هیلاكن بە دەست كار و خەوتن ماوەی ئەوەیان نیە شتێك موتابەعە بكەن یان بخوێننەوە لەسەر ئەوەی لە جیهاندا دەگوزەرێت، ئینجا لەبەر سروشتی سۆزداری و عاتیفی ئەو ئافرەتانە و حەزكردن بە ئەنجامدانی گۆڕان لە ژیایاندا، و تاقیكردنەوەی ئەزموونێكی نوێ، لەبەر ختووكەدانی هەستی دایكایەتی و پێكەوەنانی خێزان و ماڵ و مێرد، كە لە خۆرئاوا ئەو دیاردانە زۆر بەرتەسك بوونەتەوە، ئافرەتان خێراتر وەڵامی بانگەوازی دینی سەلەفی دەدەنەوە بە بەراورد لەگەڵ پیاوان، بەتایبەتی ئەگەر بزانین چۆن سەلەفیەت باسی ڕۆڵی ئاڵ و واڵای ئافرەتی موسڵمانی سەلەفیەت دەكەن، وەك شاژنی ماڵەوە و خزمەتدەكرێت و پیاوەكان لێی بەرپرسیارن و لەسەریانە هەموو پێداویستیەكانی جێبەجێ بكەن، بە مەرجێك ژنەكان زیندە بەماڵ بكرێن، و لە ژیانیاندا دوو جار دەرچن لە ماڵەوە، یەكەمیان لە ماڵی باوكیەوە بۆ ماڵی مێردی، دووەمیان لە ماڵی مێردەوە بە مردوویی بۆ ناو گۆڕ.

منیش كە بەلایان تێپەڕیم خۆم وا نیشاندا كە حەزم لێیە قسەیان لەگەڵ بكەم، بڕواتان بێت چونكە كچ نەبووم وەك لایكەكانی فەیسبووك كە زۆربەی

بۆ کچان دەچێت ئەگەر بنووسن دارا دوو داریشی دی، هیچ مەیلێکی وای نیشان نەدا بۆ ئەوەی خوا هیدایەتم بدات! تا ناچار بووم خۆم گووتم: ئەوە چی دەکەی برادەر دەتوانم بزانم ئەو نامیلکانە چییە؟! گووتی: ئێمە خەڵك بانگ دەکەین بۆ خوا و ئیسلام، تۆ چیت برادەر؟! منیش گووتم: کام ئیسلام، لەو ساتە هەستیارانەی کە هەزاران تاوان و جینۆساید دەکرێت بە ناوی ئیسلام؟!

هەستم کرد تووشی شۆك هات، زانی کچێکی فەقیری بێ زانیاری دەست نەکەوتوە! گووتی ئێمە دژی هەموو جۆرێك کوشتن و بڕینین کە بەناوی ئیسلام دەکرێت، چونکە دژی قورئان و سونەتە.

گووتم لەوە گەڕێ جارێ ئەگەر ئێستا لە دەوڵەتی خیلافەی داعش لە موسڵ یان لە سعودیە و کەنداو کۆمەڵێك بانگخوازی مەسیحی وەك ئێوە لەسەر شەقام بوەستن و بانگی خەڵك بکەن بۆ مەسیحیەت چی دەقەومێت؟! وەڵامی نەدایەوە، گووتم بێگومان دەگیرێن و دوور نیە بشکوژرێن، ئایە تۆ لەگەڵ ئەوەی ئەوانیش ئازادبن لە بانگەوازی کردن بۆ دینی خۆیان وەك ئێوە؟! ئایە تۆ لەگەڵ ئەوەیت ئێوە لێرە نەك ئازادبن لە بیروباوەڕتان، بەڵکو بانگەشەی خەلکیشی بۆ بکەن، کەچی مەسیحی و غەیرە موسڵمانەکان ئازاد نەبن لە بیروباوەڕشیان؟! کەمێك شڵەژا، گووتی ئێمە لە بەریتانیان هەرکەسەی یاسای خۆی هەیە.

کە دەڵێیت: ئێمە دژی هەموو جۆرێك کوشتن و بڕینین کە بەناوی ئیسلام دەکرێت، چونکە دژی قورئان و سونەتە!! چی دەکەیت ئەگەر ئەو کوشتن و بڕینە بە پشت بەستن لەسەر یەکێك لەو دووانە بکرێت؟ گووتی: موستەحیلە قورئان و سونە پاڵپشتیان بکات! گووتم منیش دەڵێم قورئان موستەحیلە

پاڵپشتيان بكات، بەڵام ئەوان تەفسيری تايبەتيان هەيە بۆ قورئان و بەكاری دەهێنن بۆ مەرامی خۆيان، و ئايەتەكانيشی كە باسی قيتال و شەڕ دەكات هەمووی يان بەرگری لە خۆكردنە بەرامبەر دوژمنكاری يانيش بەستراوەتەوە بە هەل ومەرجی ئەو كاتە، بەڵام ئێوە وەك سەلەفيەت هاتوون يەك ئايەتتان گرتوە بە ناوی ئايەتی يان ئايەتەكانی السيف كە بە هۆيەوە هەموو ئايەتەكانی تری لێبوردەيی و يارمەتی خەڵكی غەيرە دين، و بڕياردانی ئازادی بيروباوەڕ و ڕەتكردنەوەی زۆرەملێ لە سەپاندنی ديندا، نەسخ دەكەنەوە.

گووتی لە كام سورەت هاتووە؟! گووتم: سورەتی التوبة ﴿**فَإِذَا انسَلَخَ الْأَشْهُرُ الْحُرُمُ فَاقْتُلُوا الْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ وَخُذُوهُمْ وَاحْصُرُوهُمْ وَاقْعُدُوا لَهُمْ كُلَّ مَرْصَدٍ ۚ فَإِن تَابُوا وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ فَخَلُّوا سَبِيلَهُمْ ۚ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ**﴾ ئايەتی (5).

( 5 )جا كاتێک مانگە حەرامەكان بەسەرچوون (كە بريتيە لە: ذوالقعدة، ذوالحجة، محرم، ڕجب) ئەوە هاوەڵگەرانی پەيمان شكێن بكوژن لەهەر كوێ دەستان لێيان گير بوو، ياخود بەديل بيانگرن، سنوور دانێن بۆ چالاكيان، هەروەها كەمين و بۆسەيان لە هەموو شوێنێكی لەباردا بۆ دانێن، جا ئەگەر (پێش ئەوەی دەستی ئێوەيان بگاتێ) تەوبەيان كردو وازيان هێنا لەو كارەيان و نوێژيان كردو زەكاتياندا، ئەوە وازيان لێبهێنن و ڕێيان بۆ چۆڵ بكەن، چونكە بەڕاستی خوا لێخۆشبوو دلۆڤانە (ئەگەر ڕاست بكەن، خۆ ئەگەر بە ڕاستيشيان نەبێت ئێوە حسابی ڕواڵەت بكەن).

**﴿قَاتِلُوا الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَلَا بِالْيَوْمِ الْآخِرِ وَلَا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَلَا يَدِينُونَ دِينَ الْحَقِّ مِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ حَتَّىٰ يُعْطُوا الْجِزْيَةَ عَن يَدٍ وَهُمْ صَاغِرُونَ﴾** (29)

(ئەی ئیمانداران) دژی ئەوانەی کە باوەڕی (ڕاست و دروستیان) بەخواو بەرۆژی قیامەت نیە و ئەو شتانەی خواو پێغەمبەرەکەی بەحەرامیان داناوە بەحەرامی نازانن و پەیڕەوی دینی حەق نابن، لەوانەی کە کتێبیان پێدراوە لە (گاورو جوو) بجەنگن، هەتا ئەو کاتەی بەناچاری باج [جزیە و باج جیاوازن!] پێشکەش بەدەوڵەتی ئیسلام دەکەن.

﴿وَقَاتِلُوا الْمُشْرِكِينَ كَافَّةً كَمَا يُقَاتِلُونَكُمْ كَافَّةً ۚ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ﴾ (36)

[دژی موشریکانی (شەڕەنگێز) هەمووتان بجەنگن بە گشتی هەروەکو ئەوان دژی ئێوە دەجەنگن بەگشتی، ئینجا بشزانن کە خوا یارو یاوەری ئەو کەسانەیە کە لێی دەترسن و پارێزکارن.]

هەر بەو بۆنەوە سید قوتب یش بەو هەموو عەقڵ و بلیمەتیەوە پشتگیری لەو چەمکە سەلەفیەتە دەکات و دەربارەی ئەو سورەتە و دەڵێت: "ئەو سورەتە [سورەتی التوبة] ئەحکامی کۆتایی بەخۆوە دەگرێت دەربارەی پەیوەندی ئومەتی ئیسلام بە هەموو ئومەتەکانی تری سەر زەوی !!" هەروەها پێیوایە کە حوکمەکانی ئاشتیخوازی و تەبایی و هودنە کردن کە لە سورەتەکانی تردا هاتوون تەنها ئەحکامی قۆناغین، بەڵام ئایەتی شمشێر و ئایەتەکانی تری سورەتی التوبة بیناغەی [مەنهەجی خودایی بۆ جیهادی ڕەها دادانێت].

کە بەڕای ئەو ئەحکامی نوێی خستە سەر ئەو ئەحکامە قۆناغیانەی پێشوو، گرنگترینیان:" فەرمان کردنە بە جەنگان لە دژی ئەهلی کیتابی لادەران لە دینی خوا، تا سەرانە دەدەن بە ملکەچی..هیچیتر پەیمانی ئاشتی و هودنە یان لێ قبوڵ ناکرێت تەنها لەسەر ئەو بنچینەیەدا نەبێت، بنچینەی دانی جزیە و سەرانە، لەو حالەتەدا مافی پەیماندار [المعاهد] یان بۆ بڕیار دەدرێت، و ئاشتی بەرقەرار دەبیت لە نێوانیان ونێوان موسڵمانان".

گووتم لە قورئان گەڕێ تۆ باوەڕت بە سونەشە وەك قورئان؟! گووتی: قورئان وسونە هەردووکیان وەحین! گووتم باشە لە سونەدا هاتوە کە پێغەمبەر دەڵێت: وجُعِل رزقي تحت ظل رمحي! گووتی کوا ئەو حەدیسە لە کوێ هاتوە تابلێتە سامسۆنگەکەی دەرهێنا بۆ گەڕان بەدوای! گووتم باشە تۆ بڕوات بەو حەدیسە هەیە، گووتی نازانم دەبێت زانایانی حەدیس بڕیار بدەن!!! دوایی گووتی ڕاوەستە برادەرێکی ترت بۆ بانگ دەکەم، ئەوی تری بانگ کرد، کەسێك بوو لە خەڵکی جەزائیر و مەغریب و ئەوانە دەچوو، هەرچەندە گووتی: خەڵکی هیندم! یەکسەر هات گووتی: کێشەی تۆ چیە برادەر لە گەڵ سونە؟! خەڵکی کوێی؟ گووتم عێراق. گووتی تۆ شیعی؟!

گووتم: بەد زەنیت پێت دەڵێ دەبێ شیعی بم، چونکە گووتم عێڕاق! من شیعی نیم و سونی شافیعیم، ڕەخنەشم لە شیعە زیاترە لەسەر سونە! گووتی نابێت هیچ حەدیسێك ڕەتکەیەوە چونکە خوا دەڵێت: ئێمە وەحی دەپارێزین! گووتم: بەڵێ قورئانی مەبەستە. گووتی: تۆ دیارە قورئانی!! هەر حەزی دەکرد بمخاتە چوارچێوەیەکی تۆمەتە ئامادەییەکانی خۆی.

گووتم نەخێر باوەڕم بە حەدیسیش هەیە بەڵام بە هەمووی نا. گووتی چۆن بە هەڵبژاردن و گۆترە نا بێت! گووتم بە گۆترە نیە بەڵکو بە پێوەری قورئان و عەقڵە. گووتی بەس قورئان و سونە هەردووکیان وەحین [ویعلمهم الكتاب و الحكمة] ! هەموو سەلەف و ئیمام شافیعی یش وادەڵێت! گووتم ئەوە تێگەیشتنێکی هەڵەیە لە کتاب و حیکمەت، گوایە حیکمەت بە مانای سونەت دێت، بەر لە شافیعی تاک و تەرا ئەو قسەیە لەناو کەسانیک دەبیسترا، بەڵام شافیعی دامەزرینەری هەقیقی بیرۆکەکە بوو لە الرسالة و بەڵگە بە حەوت ئایات دەهێنیتەوە کە [الكتاب و الحكمة] پێکەوە دەبەستیتەوە! بەڵام نە زمانی عەرەبی دەڵێت حكمة بە مانای سونە دێت، نە قورئانیش پاڵپشتی دەکات چونکە ئەگەر لەو ئایەتە: ﴿**لَقَدْ مَنَّ اللَّهُ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولًا مِنْ أَنْفُسِهِمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَإِنْ كَانُوا مِنْ قَبْلُ لَفِي ضَلَالٍ مُبِينٍ**﴾ ١٦٤ ال عمران.

[ سوێند بێت بێگومان خوا منەتی ناوەتە سەر ئیمانداران کاتێک پێغەمبەرێکی بۆ ڕەوانە کردوون لە خۆیان ئایەتەکانی ئەویان بەسەردا دەخوێنێتەوە، دڵ و دەروونیان پاک و پوخت دەکاتەوە، هەروەها فێری قورئان و داناییان دەکات، بەڕاستی پێشتر لە گومڕاییەکی ئاشکرادا ڕۆچوو بوون].

ئەگەر لەو ئایەتە [الكتاب و الحكمة] بە مانای قورئان وسونە بێت چونکە وتارەکە ئاڕاستە کراوە بۆ قەومی پێغەمبەر [د.خ] لە ئیمانداران، باشە لەو ئایەتەی کە لەسەر عیسی کوڕی مەریەم قسە دەکات، دەبێت الكتاب ئینجیل بێت، کەچی ناوی الكتاب و الانجیل پێکەوە دێت:[ **وَيُعَلِّمُهُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَالتَّوْرَاةَ وَالْإِنْجِيلَ** ]٤٨ ال عمران

ئینجا ئەگەر [الحکمة] ش سونە بێت، کەوابوو حەزرەتی ئیبراهیم و ئیسماعیل پێش هەزاران ساڵ کە ئەو دوعایەیان کردوە:[ **رَبَّنَا وَابْعَثْ فِيهِمْ رَسُولًا مِنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَيُزَكِّيهِمْ ۚ إِنَّكَ أَنْتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ**] البقرة ١٢٩. مەبەستیان سونە بوو بێت، واتە هەستیان بە گرنگی سونە کردبوو پێش هەزاران ساڵ، کەچی نە پێغەمبەر باسی گرنگیەکەی کردبوو، بەڵکو نەهی کردبووش لە نووسینەوەی ونە هەتا پاش دوو سەد ساڵ لە وەفاتی پێغەمبەریش [د.خ] کەسێکی واش هەستیان بە گرنگیەکەی کردبوو].

ئینجا جارێکی تر "ابن کثیر " لە تەفسیرەکەی دەڵێت دەربارەی الکتاب دەڵێت: **الظاهر أن المراد بالكتاب ههنا الكتابة**! وادیارە مەبەسست لە کتاب فێری نووسین کردن بێت! کەچی ئەگەر وتارەکە ئاڕاستەی پێغەمبەر [د.خ] کرابێت ئەوە مەبەستی قورئان دەبێت، دەبێت کە ئاڕاستەی عیسی [د.خ] بکرێت باسی ئینجیل بکات! دەربارەی الحکمة ش دەڵێت: **والحكمة تقدم تفسيرها في سورة البقرة**!! واتە بە مەعنای سونەت دێت، کە هەتا مەسیحیەکانیش نەیانزانیوە حەزرەتی عیسی سونەتی هەبوو بێت.

قورتبیش زیاتر سەرمان لێدەشێوێنت ودەڵێت: قوله تعالى { **ويعلمه الكتاب والحكمة والتوراة والإنجيل**} قال ابن جريج : **الكتاب الكتابة والخط. وقيل : هو كتاب غير التوراة والإنجيل علمه الله عيسى عليه السلام.**

الکتاب یانی نوسین و خەت دێت، هەروەها وتراویشە کتێبێکی ترە غەیری تەورات و ئینجیل خوا حەزرەتی عیسای فێرکردوە!! چ کتێبێك دیارە نهێنی بووە؟

ئینجا سونە و حەدیس دەیان ناسازی تێدایە لەگەڵ قورئان و دەیان وسەدان ناماقوڵیشی تێدایە لەگەڵ عەقڵ! گووتی: دەتوانی یەك نمونەم بۆ

بینی؟ گووتم: حەزدەکەی دە نمونەت بۆ دەهێنم: بۆ پێچەوانەی قورئان حەدیسی مسلم ی کە لە ابو هریرە وەیە، کە دەلێت خوا بوونەوەری بە حەوت ڕۆژ دروست کردوە، کەچی قورئان دەڵێت بە شەش ڕۆژ : ﴿ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ﴾ [الفرقان:59]، حەدیسەکەش دەڵێت:

**عن "أبي هريرة" قال أخذ رسول الله صلى الله عليه وسلم بيدي فقال خلق الله عز وجل التربة يوم السبت وخلق فيها الجبال يوم الأحد وخلق الشجر يوم الاثنين وخلق المكروه يوم الثلاثاء وخلق النور يوم الأربعاء وبث فيها الدواب يوم الخميس وخلق آدم عليه السلام بعد العصر من يوم الجمعة في آخر الخلق في آخر ساعة من ساعات الجمعة فيما بين العصر إلى الليل.**

وەك نمونەی ناماقوڵیش حەدیسی البخاری یە، دەربارەی زیناکردنی مەیمونێکی محصنی خاوەن مێردێکی پیر لەگەڵ مەیمونێکی تری جاحێل، و پاش زانینی مێردە پیرەکەی، گەلی مەیمونان کۆ دەکاتەوە وهەردووکیان بەردباران دەکەن وبە سزای خوا و گەلیان و عمرو بن میمون یش کە سەحابیە دەڵێت لەگەڵ ئەوان ڕەجمم کرد.

**[حدثنا نعيم بن حماد حدثنا هشيم عن حصين عن عمرو بن ميمون قال ثم رأيت في الجاهلية قردة اجتمع عليها قردة قد زنت فرجموها فرجمتها معهم.]** صحيح البخاري

گووتی: برادەر ئەوە زانایانی فەرمودە بڕیار دەدەن کە ناسازن لەگەڵ قورئان یان نا، یان ماقوڵن یا نا! دوایی ئێمە خەریکی دەعوەین بۆ ئیسلام ئێمە کات و

توانای ئەو گفتوگۆیانەمان نیە!! گووتم: ئەی نابێت جارێ خۆت بە تەواوی لە دینەکەت تێبگەیت ئینجا داوای خەڵك بکەیت بۆ هاتنە ناو ئیسلام؟!

هەر وەك ڕاکردن ڕایان کرد، ئەوەی پێی دڵخۆش بووم گەنجێکی تەمەن بچوکیان لەگەڵ بوو، زۆر بە شەوقەوە دەیڕوانیە من و گوێی بۆ قسەکانم گرتبوو، دەتگۆت بە دوای حەلی پرسیارێك دەگەڕا ونزیك ببوەوە لە چارەسەرکردن! کاك یوسفی کوڕم چەند وێنەیەکی مونازەرەکەی گرت، ولەگەڵ ئەو نووسینە بڵاوی دەکەینەوە.

## تەكفیری و سەربڕەكان باسی ئیغتیالات دەكەن لەلای موعتەزیلە

لە وتارێكدا وەڵامی "سەرباز محمد"ـمان دابووەوە، دەربارەی ئازادی دەربڕینی بیرورِا، كە لەوە گاڵتەجاڕتر نییە سەلەفیەكی دەقپەرست كە ئامادەیە لە پێناو بچوكترین جیاوازی هەزارەها كەس تەكفیر بكەن وسەر ببەڕێنن وەك چۆن [سەلەفی ساڵحیان] وایان كردوە، كەچی هەر ئەو مەخلوقە كە عەقڵی تەسلیمی مێژوو كردوە، ئەو هەموو خوێن وملپەڕێنانەی سەردەستی پێشینانی نابینێت ودێت وباسی (ئیغتیالات) لای موعتەزیلە دەكات!! ودەڵێت: "مێژوی موعتەزیلە مێژوێكی خوێناویە لەگۆشە تاریكەكان خەریكی تەكفیر و تەفسیقی موسلمانان بوینە و بەتایبەتی ئەهلی سونە و جەماعەت كە زۆر جار لە كتێبەكانییان بەناوی ئەهلی حەدیس ناو براون".

ئەو برادەرە باش هاوسەنگی تێك چوە دەزانێت خەڵک لە سەرتاسەری دنیا خەریكن بە ئاگادێنەوە لەو درِندایەتیە دینی ومەزهەبیەی سەلەفیەتی سعودی بڵاوی دەكاتەوە، بەپێی پیلانێكی تۆكمە لەلایەن چەند وڵاتێكی كەنداو وبە پاڵپشتی زلهێزەكان بۆ ئەوەی جیهانی ئیسلام نوقمی شەڕی تایفی ومەزهەبی بێت، كەچی هێشتا كاكی عەقید پێیوایە: " .لەگەل ئەو پیلانە ئیقلیمیەی لەئارادایە بۆ شێواندنی مەنهەجی ئەهلی سونە و جەماعە هەندێك فەرخە ماركسی و قەلەمی هەرزەكار رویان كرۆتە ئاسمانی ساف و بێگەردی شیخی ئیسلام ئیبن تەیمیە و ئاسمانی پاكی سەلەفی صالح.." فەرخە ماركسی".

پیلانی چی، پیلانی هەقیقی لە بڵاوكردنەوەی ئەو سەلەفیەتە درندەیە و ئیسلام شێوێنەرەدایە، كە ئەو بودجەیەی لە بڵاوكردنەوەی ئەو فیكرە

فاشیزمەی بەناوی سەلەفیەتەوە خەرج دەکرێت، هیندە گەورەیە دەکرا جیهانی ئیسلامی پێ بکرایە بەهەشتێکی زانست ومەعریفەت.

لە وتاری پێشوو باسی تەحەدای کاک ژیوار مودەریس مان بۆی کرد بۆ مونازەرە، کەچی سەرەڕای ڕاکردنیشی لەو ڕووبەڕوو بوونەوەیە ئاماژە بە کاک ژیوار دەکات بە [فەرخە مارکسی] ئەگەر هێندە ئیستیهانە بە گەنجێکی پڕ لە توانا و داهێنانی وەك کاک ژیوار دەکەیت، فەرموو وەرە بۆ مونازەرە کردنی بزانە ئەو پڕوپوچانەی مێشکت لە ماوەیەکی کەم بۆ بەتاڵ دەکاتەوە یان نا، ئینجا چونکە کەسێکی لاسایکەرەوەی سەلەفیەکانە هەتا جنێو و تانە و تەشەرەکانیشیان بەکار دەهێنێت، چونکە زاراوەی [فەرخە مارکسی] لە علي الحلبي وەرگرتوە لە کتێبێکی بەناوی: العقلانیون الجدد افراخ المعتزلة، دوایی باسی دزینەکانی خودی علي الحلبي ناکەین، ئەوە بابەتێکی ترە. یان چاو لە ئیبن تەیمیە دەکات کە ناو لە ئەشعەریەکان دەنێت: مخانیث المعتزلة، چۆن لاسایی ناکاتەوە هەتا لە شتە پڕوپوچەکانی لە کاتێکدا ئەو پێیوایە خۆشەویستی ئیبن تەیمیە دینە وئەوەی خۆشی ناوێت دینی نیە.

لە کوردیەکی سەقەتدا دەڵێت: "دەلین کوشتن و برین لە ئەدەبیاتی (ئیبن تەیمیەیە) رەزاو رەحمەتی خوا لەو ئیمامە بەرزە" کەوابوو گومان دەخاتە ئەو هەقیقەتەی کە ئەدەبیاتی ئیبن تەیمیە کوشتن وبڕینی تێدایە، ودەڵێت " کێشەی ئەو چەشنە قەلەمە هەرزەکارە نەخوێندنەوەیە"!! سەیر لەوەدایە ئێمە پێش خوێندنەوەی ئیبن تەیمیە وامان دەزانی خوا لەو شێخی ئیسلامتری خەلق نەکردوە، بەڵام کە خوێندمانەوە دوور لە بانگەشەی چەواشەکارانەی پڕوپاگەندەی سەلەفیەت زانیمان کە ئەو پیاوە چ تەکفیریەک و چ

موحەریزکەرێکە لەسەر توندوتیژی وخوێن ڕشتنی موخالیفانی لەسەر بچوکترین هۆ، بۆ نمونە لەسەرگۆرانی بیستن.

وەك لە پۆستێکی کاك ژیواردا هاتوە: "پێدەچێ مەسەلەی تەکفیر و خوێن حەڵاڵکردن لەلای ئیبن تەیمیە وەك ئاو خواردنەوە بێ!. دەقێکتان بۆ نەقڵ دەکەم لە حوکمی باسێکی سادە و ساکار کە خۆی ناکۆکی لەسەرە، لەبارەی "گۆرانی" دەڵێ: "بیسەری گۆرانی و بەزم و ڕەزم گەر کافریش نەبێ ئەوا هیچ گومانی تێدا نییە فاسقە" (الفتوى الحموية ٣١٧). "

هەر ئیبن تەیمیە دەڵێت:" **والداعي إلى البدعة مستحق العقوبة باتفاق المسلمين، وعقوبته تكون تارة بالقتل، وتارة بما دونه، كما قتل (السلف) جهم بن صفوان، والجعد بن درهم، وغيلان القدري، وغيرهم**". (مجموع الفتاوى / كتاب الفقه باب الشهادات 35: 414)

"بانگەوازکار بۆ بیدعە موستەهەقی سزادانە بەکۆدەنگی موسڵمانان، سزاکەشی هەندێك جار بە کوشتن دەبێت، هەندێك جاریش لە کوشتن کەمتر" وەك چۆن [سەلەفەکان] جهم بن صفوان، والجعد بن درهم، غيلان القدري، غەیری ئەوانیشیان کوشت.

لە دەقێکی تردا ئیبن تەیمیە قسەیەکی ترسناکی لە ابن خزيمة وە گواستۆتەوە بە پشتگیریەوە، کە فەتوای قەتل وفڕێدانە جەستەی کوژراوەکە بۆ سەرزبڵدان دەدات، ودەڵێت: **من لم يقل إن الله فوق سماواته على عرشه بائن من خلقه وجب أن يستتاب ، فإن تاب و إلا ضربت عنقه ، ثم_ألقي على مزبلة لئلا يتأذى بنتن ريحه أهل القبلة** ! - الفتاوى الحموية -167 / والكلام لابن خزيمة نقله ابن تيمية مُقراً .

"ئەوەی نەڵێت خوا لە ئاسماندا لەسەر عەرشەكەیەتی و جیایە لە خەڵكەكەی، پێویستە تۆبەی پێبكرێت، ئەگەر تۆبەی كرد چاكە، دەنا دەبێت لە ملی بدرێت، وئینجا فرێدرێتە سەر زبڵدان، تا ئەهلی قیبلە [واتە سەلەفیەكان] ئەزیەت نەخۆن بە بۆنی بۆگەنی جەستەی".

ئەگەر سەلەفیەتی جیهادی وداعشیەكان و قاعیدە بەس ئەو فەتوایە جێبەجێكەن دەبێت ٩٠% ئۆمەتی ئیسلام بكوژن ولاشەكانیان فڕێدەنە سەر زبڵدان.

## ئایە خۆشەویستی ئیبن تەیمیە لەدینە

ئەوە قسەكانی ئیبن تەیمیەیە كاكی خوێندەوار، لەوەش خراپتری هەیە، كەچی چونكە ئیبن تەیمیە و محمد ابن عبد الوهاب پێكهێنەری عەقڵیتی سەلەفیەتی هاوچەرخ وكۆنن، عەقید سەرباز دەڵێت: " ..ئەی خوای گەورە ... من ئەو ئیمامەم لەخۆم خۆشتر دەوێ و پێشم وایە خۆشەویستی ئەو پیاوە لەدینە .... رەزاو رەحمەتی خوا لەگیانی پاكی شەیخی ئیسلام (ئیبن تەیمیە)"!!! خۆشت دەوێ كێشەی خۆتە بەڵام خۆشەویستی ئەو ملۆزمە توندوتیژە ودەمەوەر ودەمەویە دەكەیتە دین ئەوە قسەیەكی قۆڕ وبێ بنەمایە، وەك داركاریەكەی بشار بن بردی شاعیر دەچێت، كە بابەتی ئەو وتارەیە، كاتێ داركاریان دەكرد، كەسانێكی بێ عەقڵ لەوێ بوون دەیانگووت كورە ئەو پیاوە هێندە زەندیقە كە قامچی لێدەدەن لە جیاتی الحمدلله دەڵێت: ئاخ و دەڵێت ئۆف!! بەشاریش گوتی: هەی تیاچن بۆ من چێشتی تیكوشە و[تەشریب] دەخۆم تا حەمدی خوای لەسەر بكەم.

سەرەڕای ئەو هەموو خوێنڕێژیە و سەرک پەڕاندن وتەکفیرکردنە خۆشەویستی ئین تەیمیە دەبێتە دین، سەرەڕای ئەو هەموو وێرانکاریە نامرۆییەش ئەو برادەرە دەڵێت موعتەزیلە ئیغتیالات دەکەن وخوێنڕێژ بوونە لە مێژوودا! پاش ئەوەی بۆمان پوچەڵ کردەوە کە هەتا میحنەی خەڵقکردنی قورئان بە دەستی موعتەزیلەوە کرابێت، ئەمجارەیان کاکی عەقید گەڕاوە بەناو ئەو مێژووە دوورودرێژەی ئیسلامدا دەقێکی دۆزیوەتەوە لە کتێبێکی جاحظ، کە ئەوان ئەو سەرچاوە موعتەزیلیانە هەر بە سەرچاوەش نازانن، یەکەم لەبەر موعتەزیلیەتی جاحظ ودووەم لەبەر ئیعتبار دانەنان بۆ ئەو جۆرە کتێبە ئەدەبیانەی کە زۆرجار لە نوسینەکانیان ئاماژەیان پێدەکەن بە گاڵتەجاریەوە، وەک الاغاني و الف ليلة وليلة وکتێبی تر، کە گومانیان لێدەکەن وەك سەرچاوەی ڕاستی هەواڵ نەقل کردن.

دەقەکە قسەیەکی واصل بن عطاء لەسەر شاعیرێکی بەناوبانگ بە شیعری داشۆڕی وهیجا باس دەکات، گوایە پاش گوێ لێبوونی شیعرێکی یاخی بشار دەڵێت: " .**اما لهذا الملحد الاعمى المشنف المتكنى بابي معاذ من يقتله؟ اما والله لولا ان الغيلة سجية من سجايا الغالية لبعثت اليه من يبعج بطنه على مضجعه ويقتله في جوف منزله** ..سەرچاوە ( البيان والتبين ) لاپەرە ٢٤.

"کەس نیە ئەو گوارە لەگوێیە نابینا مولیحدە ناسراو بە باوکی موعاز بکوژێ ...ورگی هەڵزرێ ( ....ئەوەی کەسەیرە کوشتن و تۆقاندن بەردەوام پیشەی ئەهلی بیدەع بوە ئەو قەڵەمە چلکنانە هاتون هەرچی تاوانە دەیدەنە پاڵ ئەلی سونەو جەماعەت بەتایبەتی شەیخی ئیسلام (ئیبن تەیمیە)!" وەك بڵێی ئیبن تەیمیە پەیامهەڵگری ئاشتی بوو بێت.

ئەو کابرایە زۆر نا ئەمینانە گرنگترین بەشی ئەو قسەیەی وەرنەگێڕاوە کە دەڵێت: **[اما والله لولا ان الغيلة سجية من سجايا الغالية لبعثت اليه من يبعج بطنه]**، واتە [قەسەم بەخوا ئەگەر غەدرکوژی ئاکاری توندڕەو وغولاتەکان نەبوایە کەسێکم بۆی دەنارد ورگی هەڵدڕی] چونکە ئەگەر قسەکەشی کردبێت، سەرەڕای هەموو هەڵەیەکیش کە لە شیعرەکەی داهاتوە، کە دەڵێت:

**إبليسُ أفضلُ من أبيكم آدم *** فتبينوا يا معشر الفجار**

[ئیبلیس لە اوکە ئادەمتان باشترە،،،تێبگەن گەلی فاجیران]

**النارُ عنصره وآدم طينة *** والطين لا يسمو سمو النارِ**

[ئاگر توخمیەتی وئادەم لە قوڕە،،، قوڕیش ناگاتە ئاستی ئاگر]

**الأرضُ مظلمةٌ والنارُ مشرقةٌ *** والنارُ معبودةٌ مذكانت النار**

[زەوی تاریکە وئاگر رووناکی،،، ئاگر پەرستراوە لەوەتی هەیە]

سەرەتا هەر لە ناونیشانی وتارەکەوە خوێنەر فریو دەدات ودەیەوێت بڵێ باسی [ئیغتیالات لای موعتەزیلە] دەکات ورِوداوێك دەگێڕێتەوە کە کەسێك دەکوژرێت بە دەستی موعتەزیلەکان، بەڵام ناوەرۆکی ڕوداوەکە بە فەرزی ڕاستی جیرۆکەکە بە تەواوی پێچەوانەی ناونیشانەکەیە.

سەرەڕای ئەو شیعرەی بشار بن برد کە هەموو پیچەوانەی چەمکەکانی قورئانە، هێشتا واسڵی کوڕی عەتا بە دروستی نەزانیوە بەشاری کوڕی برد بکوژرێت.

هێشتا کاکی عەقید ئەو ناونیشانە گەورەیە [ئیغتیالات لای موعتەزیلە] دەنووسێت، کە هەموو باسەکە هەڵچونێکی عاتییفی واسڵی کوڕی عەتایە، ئەگەر چیرۆکەکە ڕاستیش بێت تەکفیرێکی فەردیە لە تاقە کەسێك دەرچوە لەناو موعتەزیلە ، دەکرێت ئەوە گشتگیر بکرێت بەسەر هەموو موعتەزیلە؟ موعتەزیلە کەی تەقدیسی تاکیان کردوە؟ کەی شێخ الاسلام یان لەناودا بوە، ئەوان تەنها هاوڕان لەسەر ئسوڵەکان، لەوەبەدەر جیاوازن لە بیروڕاکانیان، کە ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئازادی بیروڕا وڕەنگاڵەیی فیکری.

ئینجا ئەو تەکفیرە فەردیە بەراورد دەکریت لەگە ل تەکفیرە ئیجماعیەکانی شیخ الاسلامی سەلەفیەکان ئیبن تەیمیە؟! تەکفیرەکانی زانا سەلەفیەکان لە هەموو سەرچاوە سەرەکیەکاندا هاتوە، نەك وەك ئەو چیرۆکە ی جاحظ نەقلی کردوە بەبێ سەنەد، ەك کەسێکی ئیخباری کە زیاتر بایەخی بە بەهای ئەدەبی دەدا زیاتر لە بەها زانستیەکەی، وەك محمد عمارة لە کتێبی [**الاسلام وفلسفة الحكم** ] دەڵێت: جاحز هەموو شتێکی دەگێڕایەوە وبایەخی بۆ جوانکاری چیرۆکەکە بوو نەك ڕاستی چیرۆکەکە، و هەتا ابن الخیاط المعتزلی یش ڕەخنە لە جاحز دەگرێت لە کتێبی الانتصار لە بە هەڵە گێڕانەوەی دەربارەی موعتەزیلەکان وەك النظام.

لەسەر هەواڵێکی وا ئەدەبی و بێ سەنەد وفەردی دەڵێت: ئەوەی کەسەیرە کوشتن و تۆقاندن بەردەوام پیشەی ئەهلی بیدەع بوە!! کەچی ئەو هەموو کتیبە

عەقایدیەی ابن حنبل وابن تیمیە وابن عبدالوهاب فەرامۆش دەکات کە پڕاوپڕن لە تەکفیر وتەفسیق وفەتوای خوێن ڕشتن، کە لە کتێبە موعتەبەرەکانی سەلەفیەت دا هاتوە! دەقەکانی ئیبن تەیمیە لە تەکفیرکردنی گشت موسڵمانان فەرامۆش دەکات، کە لە ژێر ناوی جەهمیە، کە دیارە مەبەستیشی لەو جەهمیەیە ئەشعەری و ماتوریدیەکان بوو کە تا ئەمڕۆش زیاتر لە ٨٠ – ٩٠% موسڵمانان پێکدەهێنێت، وەك خۆی لە زۆر شوێندا ئاماژەیان پیدەکات.

هەر لەسەر ئەو بشار بن بردە دەیان ماڵپەڕی سەلەفی بە امام الزندقة وەسفی دەکەن و ئیمامە سەلەفیەکان خراپتر باسی دەکەن، وەک الإمام عبد القاهر البغدادي(ت 429هـ) ئەوەی خراپە دەربارەی دەڵێت لە (الفرق بين الفرق).

## ئيسلام تەنها بتی عيبادەتی شكاندوه نەك پەيكەری ميللەتان

له مەسـەلەی شـكاندنی پەيكەرە مێژووييەكانيش ئيسلام بە هەموو خەلافەتەكانيەوە سـەدان وڵاتی كەوتۆتە ژێر دەست كە بە هەزارەها پەيكەری ئاشكراو وبزری تێدابووە:

١- هەر لە سـەردەمی پێغەمبەر [د.خ] عائيشە ياری بە پەيكەری ئەسپی باڵدار كردوە لەبەرچاوی پيغەمبەر [د.خ]، جارێكيان كوتاڵێكی وينەداری پەيكەری هەڵواسيوە پێغەمبەر بەس پيی گووتوە لەبەر جاوم لايدە لە كاتی نوێژ چاوم پييان دەكەويت نارەحەتم دەكات، دوايی هەر ئەو كوتاڵەی كردۆتە سەرين پێغەمبەر [د.خ] بەكاری هێناوە.

٢ -قورئان باسی دروستكردنی پەيكەرەكان بۆ سولەيمان پيغەمبەر دەكات وەك نيعمەتێك: ﴿ **يَعْمَلُونَ لَهُ مَا يَشَاءُ مِنْ مَحَارِيبَ وَتَمَاثِيلَ وَجِفَانٍ كَالْجَوَابِ وَقُدُورٍ رَاسِيَاتٍ اعْمَلُوا آلَ دَاوُودَ شُكْرًا وَقَلِيلٌ مِنْ عِبَادِيَ الشَّكُورُ** ﴾ (سورة سبأ 13)

ميحراب و كۆشك وپەيكەری بۆ دروست دەكەن.... هەموو موفەسـەيرەكان لە كۆن و نوێكان دەلێن پەيكەری مسی وشوشـەيان بۆ دروست دەكەد بۆ ڕازاندنەوە وجوانی كۆشكەكەی سولەيمان پێغەمبەر.

٣ -ئەوەی دەڵێت ئەبو هۆل داپۆشراوبوو بە لمی بيابان راست نييە، چەندين مێژوونووسی ئيسلام ئاماژەيان بۆ بوونی ئەبو هۆل كردوە. وەكو:

التجيبي السبتي كه لە [٧٣٠ هـ] كۆچی کردوە، و هەروەها ابن الفضل العمري [٧٤٩ هـ] و المقريزى [٨٤٩هـ]، یەکەمیان لە کتێبی (مستفاد الرحلة والاغتراب) لە ژێر ناونیشانی [ئەبو هۆل] دەڵێت: "لە نزیك ئەو سىء ئەهرامەدا وێنەی سەرێک هەیە لە بەرد داتاشراوە زۆر مەزنە لەسەر شێوەی سەری مرۆڤ، بەڵام زۆرگەورەیە، وەك پەرستگایەکی گەورە وایە"..

٤ -مەقریزی دەڵێت لە ساڵی [٧٨٠هـ] کابرایەکی سۆفی ویستی پەیکەری ئەبو هۆل بشکێنیت، تەنها توانی ڕوخساری تێك بدات! یانی تەفکیری داعشی لە لەناوبردنی پەیکەرەکان زۆر درەنگ دەستی پێکردوە.

ئەگەر ئەوەش گووتمان ڕاستە ئەبوهۆل بە لم داپۆشرابوو، ئەی خۆ موسلمانان لە سەردەمی حەزرەتی عوسمان گەیشتنە ئەفغانستان، تیمسالی بۆزا بەقەد چیایەك بوو، جگە لە بوونی هەزارەها تیمسالی بچوکتر هیچیان نەشکاند، ئەو تیمسالەی بۆزا نە لم دایدەپۆشیت، نە هێندە بچوکە تازە بدۆزریتەوە!

- ئەی موسڵمانان هەزارەها تیمسالی بۆزا و خوداوندەکانیان بۆ نەشکاند لە هیندستان کە هەمووی کەوتە ژێر حوکمی ئیسلامی؟
- ئەی ئەی موسڵمانان هەزارەها تیمسال و پەیکەر و شوێنەواری ڕۆمانیان بۆ نەڕوخاد لە جەزیرەی سەقەلیە؟!
- ئەی یۆنان خۆ کەوتە ژیر حوکمی دەوڵەتی عوسمانی بۆ هەزارەها شوێنەوار و پەیکەری گریکیان لەناو نەبرد؟!

هەندێك کەس بە دوای بەڵگە دەگەڕێن بۆ داعشاندنی هەموو ئیسلام، زۆر بلیمەتانە پشتگیری لە تێزەکانی داعش دەکەن لە یەکسان کردنی کارە دزێو ونا

مرۆیی و ناشارستانەکانیان بە ئیسلام، ئەوەش گەورەترین خزمەتە بە داعش، جونکە ئەگەر راست بیت داعش یەکسان بیت بە ئیسلام دەبێت دژایەتی هەموو موسڵمانێك بکەین بە دایک وباوک و برا وخوشکەکانیشمانەوە، ئەوەش کرۆکی داعشیەتە!

# ناوەڕۆك

بەشی یەکەم

- ئیسلام وەك ئاینێکی جەنگاوەر
- عیبادەت یارییە لە چاو جیهاد
- ڕوحی جەنگاوەری لە قورئاندا

ئیسلام وەك ئاینێکی جەنگاوەر

بەشی دووەم

- ڕوحی جەنگاوەری لە سونەتدا
- غەزوەی بەنی قورەیزە
- ڕوحی جەنگاوەری لە لای زانایانی ئومەت

ئیسلام وەك ئاینێکی جەنگاوەر

بەشی سێیەم

- کاریگەری ڕوحی جەنگاوەری ئیسلام بەسەر داعشیەکان و موسڵماندا بەگشتی
- لە کوێی ئەو باسەدا دەگەینە ئەو دەرەنجامانە

ئیسلام وەك ئاینێکی جەنگاوەر

بەشی چوارەم

- ئیسلام وەك ئاینێکی جەنگاوەر
- بە مەرحەلی ڕوانینە بەشێك لە دەقەکان
- خوێندنەوەی ئایەتەکان لە سیاقی گشتی خۆیدا
- پێشخستنی بەرژەوەندی [المصلحة] بەسەر هەموو بەڵگەکانیتری تەشریع

ئیسلام وەك ئاینێکی جەنگاوەر

بەشی پێنجەم

- نەسخی زەمەنی

## چۆن کوردی زگاری دەبێت لە ژێرکاریگەری فۆرمی عەرەبی بۆ ئیسلام

بەشی شەشەم

- چۆن کوردی زگاری دەبێت لە ژێرکاریگەری فۆرمی عەرەبی بۆ ئیسلام
    - داعش پەروەردەی باوکانی سەلەفیەتن
    - جاشی داعش بە هەزاران جۆخین لە جاشی بەعس ترسناکترە
- میلیشیاتە شیعیەکان کێشەیەکی گەورەیە لەوانەیە کورد راکێشێت بۆ شەرێکی تایفی رەنگ
    - ئامۆژگاری نامەیەك بۆ مامۆستا کرێکار لە عەبدێکی فەقیروزەئیلەوە
    - سەرنجەکانم لەسەر چاوپێکەوتنەکەی مامۆستا کرێکار لەگەڵ جەزیرە
    - کەس چاوەڕێی فەتوای مەلا کرێکار ناکات تا پێیان بڵێ داعش چین

## درێژەپێدەری داعشیەت کێن، بۆ دروست دەبن

بەشی حەفتەم

درێژەپێدەری داعشیەت کێن، بۆ دروست دەبن

- سعودیە وەک کارخانەی سەرەکی داعشیەت
- دەسەڵاتی کوردی دایەنی کۆرپەی داعشیەتە
- ترسنۆکی ڕۆشنبیرە ئیسلامیە میانرەوەکان داعش دروست دەکات
- بێ هەڵوێستی حزبە ئیسلامیە میانرەوەکان داعشیەت دروست دەکات
    - پاشەکشەی میانرەوان لە بەرامبەر وتاری توندرەوی داعشی

ترسی دینداری منداڵەکانمان

داعش و بەعس لە یەك سەرچاوە دەرکەوتوون

دلشاد کەلاری وەك قسەکەرێك بە ناوی داعش دەدوێت

لە شەری داعشدا

ئەگەر کوردستان سێکیولار و دیموکرات نەبا؛ هەڵوێستی خۆرئاوا چۆن دەبوو

موناز ەرەیەکی سەرشەقام لەگەڵ سەلەفیەکان

تەکفیری و سەربرەکان باسی ئیغتیالات دەکەن لەلای موعتەزیلە

ئایە خۆشەویستی ئیبن تەیمیە لەدینە

ئیسلام تەنھا بتی عیبادەتی شکاندووە نەك بەیکەری میللەتان



* **محەمەد یوسف مەحمود، لە ساڵی ١٩٦٦ لە هەولێر دایكبووە. لە بواری نوسیندا بە "محەمەد هەریری" ناودێر كراوە. كۆلیژی ئادابی بەشی ئینگلیزی لەزانكوی سەلاحەدین تەواو كردوەو، لە ساڵی ٢٠٠٦ لە وڵاتی بەریتانیا ماستەری لە لە وەرگێڕانی زمانی ئینگلیزی بەدەست هێناوە.**

*** لە كۆتایی هەشتاكانەوە دەنوسێت لەسەر بابەتی سیاسی و دینی و فیكری و كۆمەڵایەتی.**

*** لەساڵی ١٩٩٥ كۆچی هەندەرانی كردوەو لە بەریتانیا نیشتەجێ بووە. سەرنوسەری روژنامەیەكی كوردی و گوڤارێكی عەرەبی بووە، بە كوردی و عەرەبی و جاروبار ئینگلیزیش دەنووسێت.**

**بە بەردەوامە لەنوسین لە رۆژنامەو ماڵپەرە كوردی و عەرەبیەكان، وەك نوسەرێكی كوردی سەربەخۆ خاوەن رای تایبەتی خۆیەتی لەسەر زۆربەی ئەو كێشانەی لە گۆڕەپانی كوردستان و جیهانی ئیسلامیدا روو دەدات.**

*** سەرەكیترین بواری نووسینی دەربارەی توندڕەوی دینییە لە كوردستان و جیهانی ئیسلامیدا بە گشتی، لەو بوارەدا سەدان وتاری بڵاوكراوەی هەیە. توندڕەوی دینی بە تایبەتی سەلەفیزم بە هەموو فۆرمەكانیەوە. بەڕای نووسەر خوێندنەوەیەك و فكرێكی نامۆیە بە سروشتی دینداری كوردی، ڕاستە لە كۆنەوە كەمێك چەمكەكانی لە ڕێگای مەزهەبی شافیعیەوە هاتۆتە ناو كورد، بەڵام وەك ئەو لێشاوە**

سەلەفیەتە نەبووە کە جێگای مەترسی جیدی بێت لەسەر ڕووحیەتی دینداری کوردی. نووسەر پێی وایە دەبێت کورد ڕزگاری بێت لە هەموو فۆرمە ئیسلامە نامۆکانی عەرەبی و غەیری عەرەبی، خاوەن دیدو خوێندنەوەو فۆرمی تایبەتی خۆی بێت.

* هەروەها لە بواری ڕەخنەی سیاسیش دەنووسێت، بە تایبەتی لەسەر ئەزموونی دەسەڵاتی کوردی. نوسەر خەبات لە پێناو بەرقەرابوونی دیموکراتیەت و مافەکانی مرۆڤ لە کوردستانی باشووردا دەکات، کە پێی وایە هەنگاوێك لە پێش بەشەکانی تری کوردستانە ودەبێت خەباتیشی جیاواز بێت لە بەشەکانیتر. لە کاتێکدا بەشەکانیتر هێشتا لە قۆناغی خەباتی ڕزگاریخوازیدان، کوردستانی باشوور تا رادەیەکی زۆر ئەو قۆناغەی تێپەڕاندوە.

لەسەر ئاستی گشتی جیهانی ئیسلامی هۆکارێکی زۆر هەن کە بەشداری دەکـەن لە پیشەسازی داعـش و داعـشیەت، ئەگەرچـی خۆشیان وەك دژی داعـشیەت نیـشان بـدەن، چـەندین بەرنامەی مـیدیایی و حکومییان هەبێت بە ناوی جەنگان لە دژی توندڕەوی و تیرۆریزم.

محەمەد هەریری